٢

# ئـــایا

# قورئان وتەی خوایە...؟

د.زاکیر نایک




چاپی یەکەم
٢٠١٦

وەرگێڕانی : ئەبوبەکر ئەحمەد

# ئایـــە

# قــورئـــان وتـــەی

# خوایە ؟

## سەلماندنێکی زانستی و لۆژیکی یە

## کە قورئان وتەی خوایە

نوسینی / دکتۆر زاکیر نایك

وەرگیرانی / ئەبوبەکر ئەحمەد



# پیشکەشە

## - دایك و باوکی خۆشەویستم

## - بەتۆی خوێنیەری ئازی

# سوپاس نامە

لە دوای سوپاس و ستایش و شوکر بۆ خوای گە ورە یارمە تی دام لە وە رگێڕانی ئە م کتێبە،... هە روە ها سوپاسی خۆم ئاڕاستە ی بە ڕێزان مامۆستا نە بە ز و دکتۆر علی دە کە م کە مامۆستای زانکۆن لە زانکۆی سە لاحە دین یارمە تیان داوم لە کاتی پێویستیدا هە ر وە ها هاوڕێی ئازیزم کاکە هێما..... دەستی خۆشی بێوێنەشم هەیە بۆکاك موسای کتێبخانەی جودی لەهاوکاری و ڕێنوێنی پێداچونەوە و هەڵەگیری و سەرپەرشتی چاپکردنی ئەوکتێبە خنجیلانەیە......

# پێناسی کتێب

---

ناوی کتێب: ئایا قورئان وتەی خوایە
نوسینی / دکتۆر زاکیر نایك
وەرگێرانی / ئەبوبەکر ئەحمەد
تایپ و نەخشاندنی بەرگ/ شێرزاد ئەڵماس
دیزاینی ناوەوە / موسامحمد
نرخ ( ٤٠٠٠ ) دینار
تیراژ ١٥٠٠ دانه
لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە سپاردنی ( ١٣٢٢)
ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە

# نایك لەچەند دێڕێکدا

دکتـۆر زاکیـر عبـدولکریم نایـك لە ١٨ئۆکـۆبەری ١٩٦٥ لە مۆمبای هیندستان لە دایك بووە، خێزانەکەی ناوی "فەرهات"ە و خاوەنی دوو منداڵە بە ناوی "فەریق و ڕوشدە "هەر لەشاری مۆمبای خوێنـدنی تەواوکـردومو بڕوانـامەی دکتـۆرای بەدەسـت هێنـاوە ، لەسـاڵی ١٩٩١ دەسـتی بە بـانگخوازی"دعـوە" کـردومە ، بـۆئەم مەبەسـتەش سـەردانی چەنـدان وڵاتـی کـردوو"ئەمریکـا ، سـعودیە،هۆنکۆنك،کویت، سـەنگافورە، ئوستوڕالیا،باشـوری ئەفریقـا، بەحـرەین ، قەتەر، ئەمەریکـای باشـور، تایلاند،کەنەدا...هتد،بەسەر کەوتویی بەشداری لەچەندان کۆڕو دیـالۆگ کـردووە ،باوتریـشیان بریتـی بـوو لەودیـالۆگەی کە لەگەڵ دکتۆر ولیام کامبێل کردی لە شیکاگۆی ئەمریکا لە ١نیسانی ٢٠٠٠.

نایك لە چەندان تەلەفزیۆن و کاناڵی نێودەوڵەتی دەردەکەوێت و بانگهێشت دەکرێت بۆ چاوپێکەوتن،چەندان کتێبی داناوە بەناوی " ئایە قورئان وتەی خوایە ، قورئان و زانستی هاو چەرخ ...."



# پێشەکی

ئیسلام ئەو خۆرمیە کە ڕۆژ ڕوناك دەکاتەوە ، ئەو مانگەیە کەڕوناکایی بەتاریکەشە و دەبەخشێت،پێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆژیاش نابێتە هۆی کەمبوونەوە و لاوازبونی ئەم خۆرەئا ئەومتا هەر زانستە بونی ئەم خۆرە ئەسەلمێنێت ،هەر پێشکەوتی تەکنەلۆژیایە دەقەکانی پەڕاوی پیرۆز پشت ڕاست دەکاتەوە و بونیان ئیسپات دەکات.

ئەم کتێبەی کەلەبەر دەستی تۆدایە،بەشێوەیەکی زانستی و لۆژیکی بون و سەرچاوەی قورئان ڕوندەکاتەوە و ئەی سەلمێنێت کە قورئان پەراوێکی ئیلاهیەو ئاسمانیە ،بەشێوەیەك کە لەگەڵ ئاخت دەدوێت ، دەستت دەگرێت و پێت دەڵێت ئەمەیە سەرچاوەی قورئان ،دەتباتە ناو جیهانی بیرکردنەوە و پێت دەڵێت کە سەرچاوەی قورئان مرۆڤ نیە ، سەرچاوە ئاسمانیەکانی تر نین.

دکتۆر زاکیر نایک کە نوسەری ئەم کتێبەیە ، هەر لەسەرەتای ئەم کتێبە کەمەندێشت دەکات بەرەو کەسێك کە داوەی پێغەمبەرایەتی دەکات و دەڵێت من پەیامبەرم ، ئەمەش بریتیە لە سەرچاوەکەم ئەیسەلمێنێت کە پێغەمبەر بۆهیچ مەبەستێکی دنیایی ئەم داوایەی نەکرردوە بەردەوامیش نەبێت کە سەرچاوەی پەیامەکەی تەنها خوای گەورە و میهرەبانە ، دواتر پێدەخاتە سەربونی خواو ، قسە لەگەڵ بونی ئەویش دەکات ،لێدوانی خۆی لەسەر چەمکی بونی ئەو دەدات.

منیش بەپێویستم زانی بەو پەڕی خۆشحاڵیەوە وەریگێڕمە سەر زمانی شیرینی کوردی، مەڵۆیەك بخەمە سەرخەرمانی کتێبخانەی کوردی .

"وەرگێڕ" ئەبوبەکر ئەحمەد

قەڵادزێ... ٢٠١٦/٢/١٥

# پێشەكی نوسەر

ئیسلام ناوی ئەو ئاینیە بێهاوتایە نیە ، كەبۆیەكەمین جار لەلایەن پێغەمبەر"*صلی الله علیه وسلم*"، بناغەی دانراوە و بەدامەزرێنەری دادەنرێت . قورئان ئەمەدەردەخات ، هەر لەسەرەتاوە خوای گەورە پەیامی ناردووە بۆ هەریەكە لە( "*نوح ، سلێمان ، داود، ابراهیم،موسا، اسحاق،عیسا ..هیتد*")"سە لامی خوایان لە سەر بێت" ، هەریەك لەم پێغەمبەرانە لەكات و ساتی جیاوازدا هاتوون ، هەرهەموویان بانگەشە یان بۆیەك بیروباوەڕكردومو یەك پەیامیان گەیاندوە ئەویش بریتیە لە( "*یەكتاپەرستی*") .

ئەم پێغەمبەرانە دامەزرێنەری ئاینە جیاوەزەكانیان نین ،بۆئەوەی بەناوی ئەوانەوە ناوبنرێت .ئە وان تەنها بیروباوەڕی پێغەمبەرەكانی پێش خۆیان زیندوو كردۆتەوە .

هەرچۆنێك بێت ، پێغەمبەر"*محمد*" *صلی الله علیه وسلم*" بوو بە دوایین نێردراوی خوا، بیرو باوەڕی پێغەمبەرەكانی پێشخۆی

زینـدوو کـردەوە ،کەئەم بنەمـایە تـاڕادە یە ك دامرکـابویەوە وە دەستکاری کرابوو لە کات و قۆناغە جیاوەزەکاندا ، بۆیە خوای گەورە بەهۆی پێغەمبەرەوە ، ئاینێکی پاکی بۆ سە ر بەشـەریەت ڕەوانە کـرد ، وەکـو دوایـن پە یامبەر لە سە ر زەوی ، خـوای گە ورە کتێبێکـی بۆنـازڵکرد بە نـاوی "قورئـان". کە ئەبێـت بە سەرچاوەی ڕێنمای بۆسەرجەم کاتەکان ،لە موعجیزەی پێغەمبەر ئەوە یە کە قوریـــان بـــۆ هەمـــوو کاتەکـــانە ، هەمـــوو پێغەمبەرەکانی تر تەنها بۆ خەڵکی خۆیان یان نەتەوەی خۆیان نێردراون ،وە پەیامەکە یان بۆ کاتێکی تایبە ت بووە . وە ئە و مـوعجیزانە ی کە خـواپێی داوون تەنهـا لە کـات وسـە ر دەمـی خۆیان بەکارهاتوون ، وە کو :-

زینـدوو کـردنە وە ی مـردوو لە لایەن ؛*("پـێغەمبەر عیـسا")-("* علیە السلام ")

یـان ؛ شـەق کردنـی دەریـا لەلایەن *("پێغەمبەر موسا")-* ("علیە السلام")

پـێغەمەبەر محمـد دواهە مـین و کۆتـاهەمین نێردراوی خـوایە وە ئە و پە یامە ی کەبۆی هاتوە بۆسە ر جەم مرۆڤە ، بۆهە تاهەتایە . خـوا لە قورئـانـدا دە فە ر موێت : "وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ". "الانبیاء-١٠٧"

("ئەی محمد" *صلی الله علیه وسلم*" ) ئێمەتۆمـان ڕەوانەنەکردووەتـەنها بۆ ئەوەنەبێت کەببیتەڕەحمەت و بەرەکەت بۆ هەموو جیهانەکان جیهانی ئادەمیزاد و گیاندار و ڕووەك و پەری و... هتد")

بۆیە ئەم موعجیزەیە کە بۆ دواین پەیامبەر دابەزیوە بۆ هەمیشەی و سەرجەم قۆناغەکانە . وە پێغەمبەریش هەروەك پەیامبەرەکانی تر خاوەنی چەندان موعجیزە بوە کە لە "**حە دیث**" دا ئاماژە یان پێکراوە ، ئێمەوەك و موسوڵمان باوەڕمان بەم موعجیزانە هەیە ، وە شانازیش بە گەورەتـرین موعجیزە دەکەین کەلەلایەن خوای گەورە وە بۆی هاتوە و بریتیە لە قورئان

کەبە موعجیزە سەلمێنراوە " ١٤٠٠" ساڵ لەمەوبەر ، وە ئە مرۆش ئەتوانرێت بسەلمێنرێت ، بۆهە تاهەتـایە . بە کورتی ، قورئان ؛ بریتیە لە" موعجیزەی موعجیزە کان".

زۆرکەس بەهەڵە تێگەیشتوون کەپێغەمەبەر بە دامە زرێنە ر ی ئـاینی ئیـسلام دادە نرێـت. هەرچەنـدە ، ئیـسلام بـونی هە بـووە هەرلەیەکەم مـرۆڤەوە "ئـادەم" کەپێـی خـستوە تە سـەر زەوی ، پاشان خوای گە ورە چەندا ن پێغەمبە ر و پە یامی تری ناردوون ، وە دواهەمـین ئـاڵقەی ئە م زنجیـرە یە بریتـی بـوو لە پێغەمـبە ر"محمد "ﷺ" *صلی اللە علیە وسلم*"و قورئانی پیرۆز.

" د.زاکیر"

# بەشی یەکەم

## پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" دانەری قورئان نیە .

تاکەشتێك کەهەموو ئەوانەی شارەزاییان لەبارەی قورئان هەیە بە ئێمـان دارو بێئمـان، یە کـدەنگن لەسـەر ئەوەی کەقورئـان بـۆیەکەمین جـار لەلایەن پیاوێـك خوێنـدراوەتە وە لەسـەدەی ١٦زاینی ،کەلە نیمچەدورگەی عەرەبی "مەککە" لە دایك بووە ناوی "محمد" بووە .

ا- نامو سوڵمانەکان سێ بیروبۆچوون "خەملاندن" یان هەیە بۆ بنەڕەت و سەرچاوەی قورئان .

١- پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم " خۆی دانەر و نوسەری قورئان بووە .

٢- پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم " لە سەرچاوەکانی تر فێربووە ، پەڕاو و سەرچاوە ئاسمانیە کانی تر .

٣- هیچ مرۆڤێك دانەری قورئان نییە ، بەڵکو وشە بە وشە دابەزیوە لەلایەن خواوە .

ب- هەرگیز پێغەمبەر " صلی الله علیه وسلم " بانگەشەی دانەرایەتی قورئانی نە کردووە.

ئەوانەی کە گومانیان هەیە سەبارەت بەبنچینەی قورئان ، وە بانگەشەی ئەوە دەکەن کەپێغەمبەر " صلی الله علیه وسلم " نوسەری قورئان بووە . ئەوا هەرگیز پێغەمبەر " صلی الله علیه وسلم " ئەرکی بەرپرسیاریەتی بنچینەی قورئانی نەخستۆتە ئەستۆی خۆی ، بەڕاشکاوی و ڕاستگۆیی وتەیەتی: ئەوە خوایە کە ئەم پەڕاوەی بۆدابەزاندووم .ئەگەر بە پێچوانەش بیربکەیتەوە ئەوا شتێکی نالۆژیکیە ، چونکە واتاکەی ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو کەسێکی درۆزنە . لەمێژودا ، ئێمە ئەوە فێربووین کە لەمنداڵیەوە هەتا تەمەنی چل ساڵی کەپەیامی پێغەمبەرایەتی بۆهاتوە یەك درۆی نەکردوە ، واتە هەرگیز بە کەسێکی درۆزن نەناسراوە .

بەپێچەوانەوە بە کەسێکی ؛ ڕاستگۆ ، بە وەفا ، بێگەرد ناسراوە ،لەلایەن دۆست و نە یارەکانیە وە نازناوی *"الامین"* ی پێبەخشراوە .

هەروەها جێگەی ئاماژە پێدانە ؛ کەزۆرێک لەکافرەکانی مەککە ئاینی ئیسلامیان ڕەتکردوە و پێیان وابوو کە پێغەمبەر *"صلی الله علیه وسلم "* درۆزنە . بەلام لەگەڵ ئەوەشدا متمانەیان پێ هە بوو ، وە شتە بەنرخەکانی خۆیان لەلای ئەودادەنا بەمەبەستی پاراستن .

وێنەی ئەم ڕاستەش ئەوەیە ،کاتێک پێغەمبەر *"صلی الله علیه وسلم "* بڕیاریدا مەککە بە جێبهێڵێت ،حەزرەتی علی لەجێگای خۆی دانا بۆگەڕاندنەوەی سەرجەم ئەمانەتەکان بۆ خاوەنەکانیان کەلەلای پێغەمبەریان *"صلی الله علیه وسلم "* دانابوو .

جارێکیان کاتێک ابوسوفیان "یەکێک لە سەرۆکەکانی بت پەرستانی مەکە "سەردانی ئیمپڕاتۆریەتی "هرقل" ی کرد ، بۆئەوە ی داوەی پشگیری لێبکات دژی پێغە مبە ر *"صلی الله علیه وسلم "* .

هرقل پرسیاری لە ابوسفیان کرد ، ئایە بەرلەوەی پێغەمبەر *"صلى الله عليه وسلم"* بانگەشەی پێغەمبەرایتی بکات هیچ درۆی کردووە ؟ یاخود ، ئایە خیانەتی لە متمانە کردووە ؟ لەوە لامدا ابوسوفیان وتی : نەخێر . تەنانەت ناحەزەکانیشی دانیان ناوە بە *"دڵسۆزی ڕستێتی و ڕاستگۆیی"* ج هۆکارێکی لۆژیکی مرۆڤ ئەتوانێت بیری لێبکاتەوە ، سەبارەت بە پێغەمبەر *"صلى الله عليه وسلم"* کەکە سێلکی درۆزن بێت ، لەکاتێکدا دەردە کەوێت کە ئەو پێغەمبەری خوایە نەك دانەری قورئان .

## بەشی دووەم

## وەلامێك بۆسەرجەم ئەو كەسانەی كە ئەوترێت پێغەمبەر *"صلى الله عليه وسلم"* بانگەشەی پێغەمبەرایەتی كردووە بۆ یەكێك لەم مەبەستانە.

١- بەمە بەستی بەدەست هێنانی مادده ***"ماڵی دنیا"***.

٢- بەمە بستی بەدەست هێنانی "پایە،هێز،شكۆوسەركردایەتی".

٣- بەمە بەستی یەكریزی و ئازادكردنی عەرەبەكان.

٤- بەمە بەستی چاكسازی ڕەوشت.

### ١- بە مە بەستی بەدەست هێنانی مادده

هەندێك كەس مشت و مڕ لەسەر ئەوە دەكەن كە پێغەمبەر *" صلى الله عليه وسلم "* بەدرۆ قورئانی داوە تەپاڵ خوا، خۆشی بە پێغەمبەر بانگ كردووە بۆ بەدەست هێنانی مادده *"ماڵی دنیا"* .

منیش هەمان بیروبۆچونم هەیە كەزۆرێك لەخەڵك بانگەشەی پێغەمبەرایەتیان كردووە " *ڕێنمای كەر و قە*

*شەکان* " بەمە بەستی قازانجی ماددی *"ماڵی دنیا"* ،بەم شێوەیە دەوڵەمەند بوون و ژیانێکی خۆشیان بەسەر بردووە .

بەڵام باری دارای پێغەمبەر" *صلى الله عليه وسلم*" پێش بڵاوکردنەوەی پەیامی پێغمبەرایەتی باشتر بوو لە دوای بوون بە پێغەمبەر . لە تەمەنی *"٢٥"* ساڵیدا هاوسەرگیری لەگەڵ *"خەدیجە"* پێکهێنا. کە ئافرەتێکی ساماندار و دەوڵەمەندبوو .

ا- یەکێك لەخێزانەکانی پێغەمبەر" *صلى الله عليه وسلم*" — " **عائشە**"-*"ڕەزای خوای لەسەربێت"*، دەگێڕێتەوە مانگێك یا دوو مانگ لەماڵی پێغەمبەر" *صلى الله عليه وسلم*" تێپەڕیووە بەبێ ئەوەی ئاگر لەماڵی بکرێتەوە ، لەبەرئەوەی هیچ شتێك نەبووە بۆ ئامادەکردن (لێنان)،ژیانیان بە ئاو خورما بە سەربردووە ، وە هەندێ جاریش ئەم خواردنە پاشکۆی شیری بزنەکانی خەڵکی مەدینە بووە "الرياض الصالحين"٤٩٢"

ب - هاوڵەکانی پێغەمبەر" *صلى الله عليه وسلم*" ابوزەر و ابوهورەیرە "ڕەزای خوایان لەسەربێت" دەگێڕنەوە کە پێغە

مبه ر" صلى الله عليه وسلم" هەرگیز دیاری ڕەتنەکردۆتەوە ، وە هەرچیەکی هە بووە بەخشیویەتی بە هەژارو نەدار. "الرياض الصالحين"٤٦٥-٤٦٦"

ج - ئەمە قوربانیه کی کاتی نیه ، بەڵام ڕێگای ژیانە ، ئەگەر پێغەمبەر" صلى الله عليه وسلم" لەوساتەدا ویستبای وەك پاشا بژی ئەوا ئەیتوانی . وە نزیکەناکی جۆرێك لەناڕەزای و نیگەرانیان هەبوو کە بۆچی لەژیانێکی ئاوادا دەژین لەکاتێکدا ئەی توانی لە ژیانێکی پڕخۆشیدا بژی ، وە پێغەمبەریش" صلى الله عليه وسلم" هەستی بە بێزاری کرد ، پاشان نیگا دابەزی .

"يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ إِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا" ٢٨"وَإِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ فَإِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنْكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا " ٢٩"الاحزاب"

(("ئەی پێغەمبەر بەهاوسەرانت بڵێ: ئەگەر ئێوەتەنها ژیانی دونیا و ڕازاوەیەکەیتان دەوێت، وەرن با هەندێك شتومەك و پارەو سامانتان پێ ببەخشم، لەودوواش بەجوانترین شێوە دەست بەردارتان ببم "٢٨"خۆ ئەگەر ئێوە خوا و پێغەمبەرەکەی و

پاداشتی رۆژی قیامەتان دەویت، ئەوە دڵنیا بن کە خوا بۆ چاکەکارانتان پاداشتی زۆر گەورە و بێ ئەندازەی ئامادەکردووە (پێغەمبەر هەموو هاوسەرانی یەك یەك تاقی کردوە هەموانیان خواو پێغەمبەرو پاداشتی قیامەتیان هەڵبژارد"٢٩")).

د - سەرەڕای دەستکەوت و سەرکەوتنەکانی پێغەمبەر" *صلی الله علیه وسلم "لەکاتی مردنیدا* قەرزدار بوو، قەڵغانەکەی لە دەستی یەکێك لە جولەکەکانی مەدینە دابوو لە جیاتی قەرزەکەی "الریاض الصالحین"٥٠٤"

هـ- لەڕاستیدا ئەگەر پێغەمبەر" *صلی الله علیه وسلم* " دانەری قورئان بوایە ، درۆی کردبا بە مەبەستی بەدەست هێنانیماڵی دنیا ، بەڵێ ئەمەکتێبی خوایە ، هەرگیز لەهەمان کتێبدا ئامەژەی بە ،

"فَوَيْلٌ لِلَّذِينَ يَكْتُبُونَ الْكِتَابَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ لِيَشْتَرُوا بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَوَيْلٌ لَهُمْ مِمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَهُمْ مِمَّا يَكْسِبُونَ "البقرة :"٧٩"

(("سا واوەیلا بۆ ئەو کەسانەی کتێب دەنووسن بەدەستی خۆیان و پاشان دەڵێن: ئا ئەمەلەلایەن خواوەیە، تا کەمێك لەماڵی دنیا بەدەست بهێنن، جا وەیل بۆ ئەو دەست و "قەڵەمانەی"کەشتی وا دەنووسن و وەیل بۆ ئەو کەسانەی کەکەسابەتی ئاوا ئەنجام دەدەن")).

ئەم ئایەتە هەرۆشە لەو کەسانە دەکات کەپەراوە ئاسمانیەکانی پێشتریان گۆڕیوە ، بەمێشکی خۆیان کتێبیان داناوە و وتویانە" *ئەمە لەلایەن خواوەیە*" بۆ مەبەست و قازانجی خۆیان .

ئەگەر پێغەمبەر" *صلی الله علیه وسلم*" خۆی قورئانی نوسیبێت ، چەندان هەل هە بوون ، لەکات و ساتەکاندا، بۆ ئەوەی ئاشکرابێت کە ئەو گەورەترین دووڕوویە "*خوانەکا*" کە ئەمە شتێکی نا لۆژیکیە . بە واتای ئەوەی" *ئەگەر پێغەمبەر قورئانی دانابێت هەر لە ناو قورئانەکەدا باس لەکەسانێك ناکات کە کتێب دەنوسن و دەڵێن ئەمە هی خوایە*"

## ٢- بەمە بەستی بەدەست هێنانی "پایە ،هێز ،شکۆ وڕابەری" .

ئـــایە دەکـــرێ پێغەمـــبەر" صلی الله علیه وسلم" بانگەشـــەی پێغەمبەرایەتی کردبێت بۆبەدەست هێنانی"پایە ،هێز،شکۆو ڕابەری؟"

ا- لەجیهانـدا دانپیـانراوە کە پێغەمـبەر" صلی الله علیه وسلم" یەکێکە لەسەرکردە سەرکەوتوەکان لەمێژودا، زانای مەسیحی "مایکڵ هارت " لیستێکی دانـاوە ، لەم لیستەدا نـاوی "١٠٠" پیـاوی کـاریگەر و ســەرکەووتی مێــژوی تۆمـارکردوە ، لە ئـادەمەوە تـــاوەکو ئەمـــڕۆ، لەکتێبەکایــدا بە نـــاوی " ١٠٠ لە کاریگەرترین کاسەکانی مێژوو" ئەم زانـا مەسـیحیە بێلایەنـانە نـاوی پێغەمـبەری خستوەتە یەکەم نـاو لە لیستەکەدا ، " ئەمە تـێکەڵە یە کـی ئـاینی و عەلمـانیە کە پێغەمبەر" صلی الله علیه وسلم" بە کـاری گەرترین مرۆڤ دادەنرێت لە مێژودا.

ب- مرۆڤێـك ئەگەر خـاوەنی ئەم ڕەوشـتانە بێت ئەی تـوانی داوای ڕابەری و هێزبکـــات ، بە بـــۆ بانگەشـــەکردنی پەیـــامی

پێغەمبەرایەتی ، ڕەوشتی ئەوە نیشان دەدات کە نەبەدوای شکۆ نە بەدوای هێـزدا گەڕاوە .هیـوا خواسـتن بـۆ پـایە و هێـز لەگەڵ خـواردنی بـاش، جلـوبەرگی جـوان ، شـوێنی گەورە ، کۆشـکی مەزن و پاسەوانی جۆراوجۆر وابەستە دەکرێت .

سـەرەڕای ئەو ئەرکە قورسـەی کەلەسـەر شـانی بـووە وەك کەسـێکی سیاسـت مەدار وە ئەو بونەکـۆمەڵایەتیەی کەهەی بـووە ، پێغەمـبەر " *صلی الله علیه وسلم* " شـیری دۆشـیوە ، جـل و پێڵاوەکانی چاك کردونە وە و کاری ماڵەوەی کردووە.

ژیانی نمونەیەکی سەرنج ڕاکێشە لە سادەیی و بێفیزیـدا ،لە سەر زەوی خەوتـوە ، بە بێ بـونی هـیچ پاسـەوانێك ڕۆیشتووە بـۆ بـازاڕ ،دەعـــومتی هەژارانـــی ڕەتنەکـــردۆتەوە و وە هەرشـــتێکیش ئامەدەکرابێ خواردویەتی .

ج- لەسـەر خۆقسـەی کردووە و گـووێی گرتـوە لە ئەوانەی کەلە دەوریـەری بوون ، قورئان دە فەرموێت :-

"وَمِنْهُمُ الَّذِينَ يُؤْذُونَ النَّبِيَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌ ۚ قُلْ أُذُنُ خَيْرٍ لَكُمْ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ وَرَحْمَةٌ لِلَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ ۚ وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ رَسُولَ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ"-"التوبة"٦١"

(("هەندێکی تر "لەدووڕووەکان" نەوەندەنەفامن، ئازاری دڵی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەدەن، بەوەی کەدەڵێن: "محمد" گوێ بۆ هەموو کەس دەگرێت، پێیان بڵێ: گوێ بیستی خێرەبۆتان، باوەڕی پتەوی بەخوا هەیە، باوەڕی "بەڕاستگۆی" ئیماندارانیش هەیە، ڕەحمەتیشەبۆ ئەوانەتان کەباوەڕیان هێناوە، "بەڵام" ئەوانەی ئازاری پێغەمبەری خوا دەدەن سزایەکی بەئێش بۆیان ئامادەیە")).

**د- جارێکیان یەکێك لە نوێنەری بت پەرستەکان بەناوی " عتبە " هاتە لای پێغەمبەر و وتی ئەگەر وازلەم پەیامە بهێنیت ، ئەوا دەتکەین بە دەوڵەمەندترین پیاو لە کۆمەڵگادا ، بەرابەری خۆمان لەگەڵ هێزێکی تەواو تەنانەت تاجت لەسەر ئەنێین وەك پاشایەك ئەگەر خۆی ویستبای ئەی توانی ببێت بەڵام تاکە شتێك کەلێیان ئەویست ئەوە بوو کەواز لەم پەیامە بهێنێت"**

***هیچ خوایەك نیە جگە لە خوای هەموو جیهان ،خوای سەرجەم مرۆڤ".***

ئەگەر پێغەمبەر" صلی الله علیه وسلم" بەدوای سامان ، شکۆ و هێزدا گەڕابا ، ئەوا هەرگیز ئەو هەلە زێڕینەی لەدەست نەدەدا. لەگەڵ ئەواشدا ، داواکاریەکانی ئەوانی ڕەتکردەوە .

ه- جارێکی تر هەوڵیاندا،لەڕێگەی مامیەوە کە خۆشەویستی پێغەمەر" صلی الله علیه وسلم" بوو قایلی بکەن کەواز لەپەیامی پێغەمبەرایەتی بهێنێت و جیهانی هێز و پایە قبوڵ بکا ، بەڵام لە وەڵامدا وتی :-

*"ئەی مامە ، ئەگەر ئەوان خۆر لەسە ر شانی ڕستم و مانگ لە سە ر شانی چەپم دانێن بۆ ئە وەی واز لەم پەیامە بهێنم ئەوا هەرگیز وازی لێناهێنم ،هە تا لە پێناو بەرگری ئەم ئەمانەتە دا دەمرم ،یان خوا بڕیار ئە دات و ئە و دەیەوێت"*

و- مردنی کوڕە خۆشەویستەکەی پێغەمبەر" صلی الله علیه وسلم" - "ابراهیم" هاوتا بوو لە گەڵ گیرانی خۆر ، خەڵك پێیان وابوو کە ئەمە موعجیزەی خوایە ، ئاسمان و زەوی بۆمردنەکەی ابراهیم دەناڵێنن ، وە پێغەمبەریش زۆر تووڕە بوو لێیان

"صحیح البخاری"١٥٢"

ئایە :- ئەمانە سیفەتی مرۆڤی خۆپەسندن یان کەسێکی هێز ویست ،چ شتێك پاساو بۆ ژیانێکی پڕ قوربانی و ئازاریەخش دەهێنێتەوە ، تەنانەت لەکاتێکدا دەسەلاتی تەواوی هەبوو بەسەر نەیارەکانیدا،چ شتێك سادەی و شکۆداری ئەوڕون دەکاتەوە ،کە نیشانی داوە لەکات و ساتە خۆشەکانیدا، وە سوریش بووە لەسەر ئەوەی کەئەم سەرکەوتنە لە لایەن خواوەیە نەك بەهۆی بلیمەتی خۆی.

## ٣- بەمەبەستی یەکرێزی و ئازادکردنی عەرەبەکان .

*ئە و تیۆرە ی کە دەڵێت پێغەمبەر " صلی الله علیه وسلم " قورئانی داناوە بە مە بە ستی یەکرێزی و ئازادکردنی عەرەبە کان ، زۆر قورسە بۆبەرگری کردن لەلایەن پە یرەوانی ئەم بیردۆزە .*

*ا- هیچ ئایەتێك لەقورئاندا نیە کەباس لە یەکرێزی و ئازادکردنی نەتەوەی عەرەب بکات ، لە ڕاستیدا چەمکی قورئان بریتیە لە "**الامة**" .*

قورئان داوای یەکرێزی بۆهەمەوو مرۆڤ دەکات لە سەر بنەمای "ڕاستی"

"يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ" -"الحجرات :١٣"

("ئەی خەڵکینەبێگومان ئێمەهەمووتانمان لەنێرو مێیەك دروستکردووە"کەباوکەئادەم و دایکەحەوایە" و کردوومانن بەچەندەها گەل و تیرەو هۆزی جۆریەجۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بەیەکەوە... بەڕاستی بەرێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەتان کەزۆرتر لەخواترسەو فەرمانبەرداری خوایە، بێگومان خوا زاناو ئاگایەبەهەمووان") .

لەلای خوای گەورە بنەمای داد پەروەری بۆ یەکرێزی بریتی نیە لە "تیرە ، ڕەنگ ، ڕەگەز ، سامان ، نەتە وە ،پە یوەندی سیاسی وخوێنی " تەنها بریتیە لە "تە قوا" - "ڕاستی ودروستی ، خواناسی و بیروباوەڕ"

ب- ئەمەش بە واتای ئەوەی کە کوڕ لەباوك جیادەکاتە وە ، باوك لە کوڕ ، مێرد لە هاوسەر ، و هاوسەر لە مێرد... هتد .

"قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُمْ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّىٰ يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ" -"التوبة :٢٤"

(("ئەی محمد "صلی الله علیه وسلم" پێیان بڵێ: ئەگەر باوو باپیرانتان و براکانتان و هاوسەرانتان و عەشرەت و هۆزتان و ماڵ و سامانێك کەبەدەستتان هێناوە، یاخود بازرگانیەك دەترسن کەشکان و بێ بازاڕی ڕووی تێبکات و خانوویەرەو کۆشك و تەلارێك کەحەز دەکەن لێتان تێك قەچێت و دڵخۆشن پێی، لاتان خۆشەویستترو نازدارتر بێت لەخواو پێغەمبەرەکەی و جیهادو تێکۆشان لەپێناو ڕێبازی ئەو زاتەدا، دەئەوەچاوەڕوان بن، هەتا خوای گەورەدێت بەفەرمانەکانیەوەو "تۆڵەتان لێ دەسێنێت"، خوای پەروەردگاریش هیدایەت و ڕێنموویی قەومی یاخی و لەسنوور دەرچوو نادات."))

ج- ئەو یەکریزیەی کە باڵی کێشا بەسەر نیمچە دورگەی عەرەبی لەدوای سەرکەوتنی ئیسلام هەزری بوو ، مەبەست لێی

هەموو جیهان بوو ، ئەم یەکڕیزیەش بەهۆی هاندانی قورئان بوو ، بۆنمونە خوای گەورە داوا دەکات :-

"وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا ۚ وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنْتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُمْ بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا وَكُنْتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِنَ النَّارِ فَأَنْقَذَكُمْ مِنْهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ "- "آل‌عمران : ١٠٣"

(("هەوڵ بدەن" هەر هەموتان بەتوندی دەست بگرن بەئاینی خواوەو پەرت و بڵاو مەبن، یادی نازو نیعمەتی خوا بکەنەوەلەسەرتان، "چونکە" کاتی خۆی دوژمنی یەکتر بوون، ئەوەبوو دڵەکانتانی بەهۆی نیعمەتی "ئیسلامەوە"پەیوەست کرد بەیەکەوەو هەموو بوونەبرای یەکتر "هەروەها ئەو کاتە ئێوەلەسەر لێواری چاڵێکی ئاگر وەستا بوون و "خەریك بوو بکەونەناوی"، بالام خوا "بەڕەحم و میهرەبانی خۆی" لەو ئاگرەڕزگاری کردن، ئابەو شێوەیەخوا ئایەتەکانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بۆ ئەوەی هیدایەت وەربگرن")

د- ئـایه یەکرپـزی عەرەبەکـان بە هـۆی تێرامـانی سـەرەکی پێغەمـبەر" *صلی الله علیه وسلم*" بـووە ؟ ئەی تـوانی بەخۆشـی پێـشنیاری بـوون بە پاشـا قبوڵبکـات ، پاشـان هێـزی خـۆی بەکاربهێنێـت بـۆ بنیـات نـانی نـیمچە دورگە یەکـی عەرەبـی یەکگرتوو .

ه- لە قورئانـــدا چەنـــدین ئـایەت هەن کە پـێچەوانەی ئەو بیرۆکەیەن کە پێغەمبەر" *صلی الله علیه وسلم* " هەوڵیدابێت بۆ بنیات نانی نە تەوەی عەرەب ،خـوا لە قورئـانی پیرۆزدا دەفەرموێت :-

"وَإِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَىٰ نِسَاءِ الْعَالَمِينَ" آل‌عمران :٤٢"

("هەروەها یادیان بهێنەکاتێك جبرئیلی فریشتەوتی: ئەی مەریەم بەڕاستی خوا تۆی هەڵبژاردووە خاوێن و پاکیزەی کردویت، هەڵی بژاردویت و ڕێزی داویت بەسەر هەموو ئافرەتانی جیهاندا.")

بۆچی محمـد ، عەرەبێـك ، بـاس لەمەریەم بکـات دایکـی عیسا ،کە بەنواسـڕائل بـووە " کە هەڵبژێـردراوە لە سـەروی ئافرەتـانی

هەمـــوو نەتەوەکـــان " کە شـــەرەفێکی ئـــاوا لە ئینجیلیـــشدا نـــادۆزرێتە وە .لە کاتێکـــدا ، لە قورئانـــدا ســـورەتێکی تە واو بەناوی *"مریەم"* هەیە ، دایکی پێغەمبەر عیسا.

هـــیچ کـتێـــب و ســـورەتێك نـــیە لە ئینجیلـــدا بە نـــاوی *"مـــریەم"* کەواتە ، بـــۆچی پێغەمـــبەر هـــانی عەرەباکـــان دەدات تـــاوەکو سوپاســـی عیـــسا بـــکەن لە کاتێکـــدا ئەمە دژی عەرەبەکـــانە ســـەرەڕای ئە وەش بڵێـــت کە *" بەنواســـرائیلیەك هەڵبژێـــردراوە لە سەروی ئافرەتانی هەموو نەتەوەکان "*

ئەگەر ئەو ویـــستبای نەتەوەی عەرەب بگـــرێتە خـــۆی، ئەوا عەرەبەکـــانی بەرز دەنرخانـــد و یەکێـــك لەئـــافرەتە عەرەباکـــانی هەڵدەبژارد . بۆنمونە *" دایکی ، خێزانی یان کچەکەی "* وەکو سەرداری ئافرەتانی هەموو نەتەوەکان "

بەڵام وەڵامەکە لە م ئایەتەدا دەردەکەوێت ،خوا دەفەرموێت :-

"ذَٰلِكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ۚ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَامَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ "-"آل‌عمران :٤٤"

("ئـەوشـتانەی باسـکران چـەنـد هـەواڵێـك بـوون لـەغـەیبـەوە، ئێمەلەرێگەی "وەحی" و سروشەوەبەتۆی دەگەیەنین، خۆ تۆ "ئەی محمـد "صـلی اللـەعلیـەوسـلم" لـەوێ نـەبوویـت کاتێـك پێنوسەکانیان هەڵئەدایە"ئاوەوە، پێنوسی کێ سەرکەوت و ناو نەبـرد" ئـەوەیـان مـەریـەم پـەروەردەبکات، تۆ لـەوێش نـەبوویـت کاتێك کێشەیان هەبوو "لەسەر ئەوەی کێ بەخێوی بکات").

و- هەروەها *"بیردۆزی یەکێتی عەرەب"* ناتوانێ ڕونکردنەوەیەکی قایلکەربێت ، بەهۆ ئەم ئایەتەی خوارەوە . خوا دەفەرمووێت :-

"يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اذْكُرُوا نِعْمَتِيَ الَّتِي أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّي فَضَّلْتُكُمْ عَلَى الْعَالَمِينَ"-"البقرة :٤٧"

("ئـەی نـەوەی ئیـسرائیل: یـادی نـازو نیعمـەتـەکـانم بکەنەوەکەڕشتومەبەسەرتاندا بێگومان من گرنگی زۆرم پێـداون و نازونیعمـەتـی زۆرم پێبـەخـشیوون "لـەخـواردن و خواردنـەوەلـەمـوعجیزەی جۆراوجـۆر، لـەچـارەسـەرکردنـی کێشەکانیـان، ... هتد"مـن زیـادەڕێـزی ئێوەم داوەبەسەر هەموو

خەڵکیدا "ئەڵبەتەلەسەردەمی خۆیاندا و ئەوانەی کەپابەندی ئاینی خوا بوون، بەتایبەتی پێغەمبەران و پیاوچاکان...").

## ٤- بەمە بەستی چاکسازی ڕەوشت.

لەوانەیە هەندێك " چاکسازی ڕەوشتی " وەك کێشەیەکی هاندەر سەیرکەن ، کە پێغەمبەر " *صلى الله عليه وسلم* " پشتی پێ بە ستبێت بۆ کۆکردنە وەی قورئان .

قورئان دەفەرموێت :-

"وَ مَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ قَالَ أُوحِيَ إِلَيَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَيْءٌ وَمَنْ قَالَ سَأُنْزِلُ مِثْلَ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ ۗ وَلَوْ تَرَىٰ إِذِ الظَّالِمُونَ فِي غَمَرَاتِ الْمَوْتِ وَالْمَلَائِكَةُ بَاسِطُو أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوا أَنْفُسَكُمُ ۖ الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنْتُمْ تَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ غَيْرَ الْحَقِّ وَكُنْتُمْ عَنْ آيَاتِهِ تَسْتَكْبِرُونَ "الأنعام :٩٣"

("کێ لەوستەمکارترەکەدرۆ بۆ خوا هەڵبەستێت و یاخود بڵێت: منیش وەحی و نیگام بۆ هاتووە، لەڕاستیشدا هیچی بۆ نەهاتبێت، هەروەها ئەو کەسەش کەوتویەتی: منیش وەك قورئان کتێبێك دادەبەزێنم وەك خوا دایبەزاندوە، خۆ ئەگەر ئەو

ستەمکارانـەببینـی چـۆن لـەئـێش و ئـازاری سـەرەمـەرگـدا "گیرێکیـان خـواردووە" فریشتەکانیش دەستیان لێدەکـەنەوەو لێیان دەدەن و "پێیان دەڵێن": ئادەی گیانتان بدەن بەدەستەوە، دەی رۆحتـان دەرکـەن، ئـەمـرۆ لـەتۆڵـەی "خـوا نـەناسـیتاندا" سـزاو ئـەشـکـەنجـەی ڕیـسوایی و شـەرمـەزاری دەدرێـن، چونکـەشـتی ناحـەقتـان بـەدەم خـواوەهـەڵـدەبـەسـت و خۆتـان بـەگـەورەدەزانـی لـەبـەرامبـەر ئایـەت و فـەرمانـەکـانی خـوادا و لـووت بـەرزیتـان نەیدەهێشت باوەڕی پێ بهێنن".

ئەم ئایەتە هەڕەشەی سزای سەخت دەکات بۆ درۆزنەکان ، ئەگەر پێغەمـبـە ر" *صلی الله علیه وسلم*" نوسـەری قورئـان بـوایە ، ئـایە قورئانی داوە تە پاڵ خوا؟ وە وەسفی خۆشی دەکات بە خراپترین پیاو؟ .

ئایە ئەو دانەری قورئـان بووە؟ بۆیە زۆر ئەگەر هە بوو ڕۆژێك ئەم هەڵبەستنە پەردەی لەسەر لابدرێت و بکەوێتە کێشە وە .

ا- یەکێك لەمەبەستەکانی پێغەمبەر " صلی الله علیه وسلم " و قورئان بریتی بوو لە " چاکسازی ڕەوشتی " بەڵام تەنها بۆ عەرەب نا بەڵکو بۆ هەموو جیهان .

ئەگەر پێغەمبەر " صلی الله علیه وسلم " بەهەڵە بانگەشەی قورئانی کردبێت و وتبی ئەمە هی خوایە ، وە خۆشی بە دانەرەکەی دانابێت ، ئەو هەموو ئایەتانەی لە قورئاندا باس نەدەکرد ، شتێکی ئەوتۆی لە قورئاندا دەنوسی کە قەشە "پۆڵ" لە ئینجیلی " نیو تێستامێنت " بەشی دووەم لە پەرتوکی پیرۆزدا . بەشی "٣" خەتی "٧" " ئەگەر درۆی من ڕاستەقینەی خوا شکۆداربکات ، پاشان ئه وه من گوناهبارنیم " .

ئەم خەتە لە ئینجیلدا ئەوە دەگەیەنێت ،کە خواپێویستی بە درۆیە بۆسەلماندنی گەورەی خۆی .لەگەڵ ئەوەشدا ، خوا پێش ئیسلامیش هەر گەورەبووە ، بۆیە پێویستی بە هیچ درۆیەك نیە بۆئەوەی گەورەی خۆی بسەلمێنێت .

بەپێچەوانەی ئاینەکانی تر ، لەئیسلامدا ، ئامرازو وەسیلەکان جیانەکراونەتەوە لە کۆتاییەکانیان .ئەگەر دادپەروەریت دەوێت

پێویستە داد پەروەر بێت ، ئەگەر ڕاستیت ئەوێت پێویستە ڕاستگۆبیت ،زۆرێك لەخەڵك تەنها گرنگی بە ئەنجامی کۆتایی دەدەن ،وە گرنگی بە ڕونکردنەوە و ئامرازەکانی گەیشتن بە ئەنجام نادەن .

هەندێ کەس ڕاستی دەزانێت بەڵام بۆسەلماندنی ئەوڕاستیە ،گفتوگۆی هەڵە بەکاردەهێنێت بۆنمونە :-

ئەگەر کەسێك بڵێت ٢+٢=٤ ئەوا ڕاستگۆیانە دەدوێت ،بەڵام ئەگەر داوای ڕونکردنەوە بکەی بۆ وەڵامەکەی ،لە ئەنجامدا دەڵێت مامۆستاکەم فێرمی کردووە ،وەڵامەکە ڕاستە ، بەڵام ڕونکردنەوەکە هەڵەیە.

وادابنێ کە: ئەگەر مامۆستا فێری کردباو پێی وتبا ،٢+٢ =٥،پاشان ئە و کەسە هەڵە ئەبوو ، ڕونکردنەوەکە بەبەهاکەی خۆی ڕاست ئەبێت .

نمونەیەکی تر :- ئەگەر تۆ دوو دراوی ئاسن هەڵگری پاشان دوو دانەی تر زیاد بکەی ، سەرەنجام دەبێتە چوار دراوی ئاسن ، بۆیە ئەگەر تۆ گفتوگۆی هەڵە بەکاربهێنیت بۆ سەلماندنی ڕاستی ،

ئەوا کەسێکی تر لەوانەیە هەمان گفتوگۆ هەڵەیە بەکاربهێنێت بۆسەلماندنی شتێکی ناڕاست .ئەو دەڵێت کە مامۆستاکەی وتویەتی ٢+٢=٤ پاشان تۆش باوەڕدەکەی .

بەهەمان شێوە ئەمە شتێکی نالۆژیکیە ئەگەر بڵێی من تەلەفۆن بەکارناهێنم چونکە " *ئەلیک ساندەر گراهام بێل*" دای هێناوە کە کەسێکی درۆزنە .

ب- هەمان ئاگادارکردنەوە سەبارەت بە "*درۆو هەڵبەستن*" دراوە لە قورئاندا .

"وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الأَقَاوِيلِ "-" لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ "-" ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ "-" فَمَا مِنكُمْ مِنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ "الحاقة :٤٤-٤٧ "

("خۆ ئەگەر "محمد صلى اللەعليەوسلم" هەندێك قسەو گوفتار بەدەم ئێمەوەهەڵبەستایە"- "ئەوەبەهێزو دەسەڵاتی خۆمان دەمانگرت"- "لەوەودوا ڕەگی دڵی دەپچڕێنین و دەیمرێنین "-" ئەوسا هیچ کەسێك نی یەلەئێوەبەربەست و بەرگری بکات لەئێمە ")

"أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا ۖ فَإِنْ يَشَإِ اللَّهُ يَخْتِمْ عَلَىٰ قَلْبِكَ ۗ وَيَمْحُ اللَّهُ الْبَاطِلَ وَيُحِقُّ الْحَقَّ بِكَلِمَاتِهِ ۚ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ "-"الشورى :٢٤"

("بەڵکو خوانەناسان دەڵێن: محمد "صلی اللەعلیەوسلم "بەدەم خواوەدرۆی هەڵبەستووە!! جا ئەگەر خوا بیەوێت مۆر دەنێت بەسەر دڵت داو هیچت بۆ ناوترێت، خوایش دەیەوێت ئاسەواری پەتاڵ و ناحەقی نەهێڵێت و حەق و ڕاستی بەفەرمانی خۆی بچەسپێنێت، چونکەبەڕاستی ئەو خوایەزانایەبەودی کەلەتوێی دڵ و دەروون و سینەکاندا شاراوەیە").

"إِنَّمَا يَفْتَرِي الْكَذِبَ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَاذِبُونَ "-"النحل :١٠٥"

("بێگومان هەر ئەوانەدرۆ هەڵدەبەستن کەباوەڕیان بەئایەتەکانی خوا نیە، هەر ئەوانیش درۆزنن و درۆیان کردۆتەپیشە").

ج- پێغەمبەر " *صلی الله علیه وسلم* " هەموو قورئانی لەیەك دانیشتندا" ساتدا" بڵاونەکردۆتەوە ، ئەو بەش بەش قورئانی خوێندۆتەوە لەماوەی "٢٣" ساڵدا ، کەلەو ماوەیەدا هەرپرسیارێك کرابێت وەڵام دراوەتە وە .

قورئان دەفەرموێت :-

"يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ وَإِنْ تَسْأَلُوا عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ الْقُرْآنُ تُبْدَ لَكُمْ عَفَا اللَّهُ عَنْهَاۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ "-"المائدة :-١٠١"

("ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوەپرسیار مەکەن لەهەندێك شت، کەئەگەر ئاشکرا بکرێت بۆتان سەغڵەتتان دەکات، خۆ ئەگەر پرسیار بکەن دەربارەیان لەکاتی دابەزاندنی قورئاندا ئەوەبۆتان ئاشکرا دەکرێت، خوا چاوپۆشی لێ کردوون و "باسی نەکردوون" خواش لێخۆشبوو و بەحیلم و حەوسەڵەیە").

خەڵك ئەمەی بەهەل زانی و پرسیارگەلێکی زۆریان کرد لەبارەی " مەی ، قومارکردن ، چاکە ،خوێنی بێنوێژی ،مانگی نوێ ،گەنینی ناو " تەنانەت پرسیاری مێژوویش وەك "چیرۆکی ذولقەرنەین " وە لەزۆر شوێندا قورئان ئامازە بەم جۆرەپرسیارانەدەکات و دەفەرموێت:- ("ویسئلونک")

د- لەقورئانــدا بەڵگەیەکــی تە واو هەیە ســەبارەت بە *"بیــردۆزی چاکسازی ڕەوشتی"* چونکە لەچەندان شوێندا پێغەمبەر *"صلی الله علیه وسلم"* لە لایەن قورئانەوە راستکراوەتەوە ،بۆ نمونە :-

جارێکیــان کاتێــك پێغەمــبەر *"صلی الله علـیه وسـلم"* ســەرقاڵی بانــگهێشتکردنی سە رۆکەکانی قورەیش بوو لە مەککە ، موســوڵمانێکی کوێری هەژار بەنــاوی " عبــد الــله کــوڕی ئــوم مەکتــوم " هــات و گفتوگۆکەی بــڕی ، لە بەر ئەوەی ئەیویــست لەبــارەی قورئــانەوە فێربێــت . پێغەمــبەریش گرنگــی پێنەدا ، وە مــۆنی پێــوە دیــار بــوو . بەرلەوەی پێغەمــبەر وشــەیەك بڵێت نیگــا دابەزی کەبۆهەمتاهەتایە لە قورئاندا دەمێنێتە وە

"عَبَسَ وَتَوَلَّىٰ "-" أَنْ جَاءَهُ الْأَعْمَىٰ"-"وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُ يَزَّكَّىٰ "-""أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنْفَعَهُ الذِّكْرَىٰ "-"عبس : ١-٤"

("ڕووی گرژکــردو ڕووی وەرگێــڕا "مــەبەســت پێغــەمبــەرە"صــلی اللــەعلیــەوســلم" کاتێــك "عبداللــەی کــوڕی ام مکتــوم) کەنیمانــدارێکی نابینــابوو هــات بۆ خزمــەتی، ئەویــش هــەنــدێك لەسەرانی قورەیشی کۆ کردبۆوەبەئومێدی هیدایەتیان، عبدالله

وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خوا چی فێرکردوویت منیش فێر بکە، پێغەمبەر "صلی اللەعلیەوسلم" پێی ناخۆش بوو کەقسەکانی پێ دەبڕێت، لەبەرئەوەرووی گرژکرد و ڕووی وەرگێڕا. بۆیەسەرەتای ئەم سوورەتەدابەزی کەگلەییەلەپێغەمبەر "صلی اللەعلیەوسلم"-" لەبەرئەوەی نابیناکەهات بۆ لای"-" جا تۆ چوزانیت بەڵکو ئەو هاتبێت تا دڵ و دەروونی خاوێن بکاتەوە"-" یاخود ئامۆژگاری وەربگرێت، تا ئامۆژگاریەکەسوودی پێبگەیەنێت").

هیچ کەسێکی تر جگە لە پێغەمبەر " *صلی الله علیه وسلم* " بەم شێوەیە پرسیاری لێنەکراوە ، جاچ " قشە بێت یا تاوانبار" بەڵام لەبە ئەوە ی کەسێکی زۆر بە میهرەبان بووە لە گەڵ هەژاران ، وە بە بێ هیچ دودڵیە ك ئەم نیگایەی لە قورئاندا بڵاوکردەوە ، وەهەر جارێك کەئەم پیاوە کوێرەی ئە بینی سوپاسی دەکرد .

# نمونه كانی تر :-

١- نیگا سەباردت بە سوێنخواردنەكەی پێغەمبەر" *صلى الله عليه وسلم*" دابەزی ، كاتێك سوێندی خوارد بۆتۆڵە سەندنەوەی مامی "أمام هەمزە "

"وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِۦ وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِلصَّابِرِينَ "- "النحل :١٢٦"

("ئەگەر ویستتان تۆڵەبكەنەوە، دەبێت هەر بەقەدەر ئەو ستەمەی كەلێتان كراوەتۆڵەبكەنەوە، خۆ ئەگەر ئارام گرو خۆگر بن، ئەوەچاكترەبۆ ئارامگرو خۆگران").

٢-سەبارەت بە زیندانیەكانی شەڕ

"مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي الْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللَّهُ يُرِيدُ الْآخِرَةَ ۗ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ "-"الأنفال :٦٧"

("بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەبووەكەدیلی هەبێت، هەتا كاتێك چاك پایەدارو جێگیر دەبێت لەزەویدا، "مەگەر"كەلوپەل و شتومەكی دنیاتان دەوێت؟! لەكاتێكدا خوا "سەرفرازیی"ئەو جیهانی دەوێت

و قیامەتی مەبەستەو خوا بالادەست و دانایە "سەرکەوتن بەئیمانداران دەبەخشێت و دانایەلەتاقی کردنەوەیاندا").

٣- نوێژ کردنی بۆ دوڕوەکان

وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰ أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦ إِنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَمَاتُوا وَهُمْ فَاسِقُونَ"-"التوبة :٨٤"

("هیچ کات لەسەر هیچ کەس لەو دووڕووانەنوێژ نەکەی کەمرد، لەسەر گۆڕەکەشی مەوەستە، چونکەبەڕاستی ئەوانەباوەڕیان بەخواو بەپێغەمبەرەکەی نەبوو و مردیشن لەکاتێکدا لەدین دەرچوو بوون").

# بەشی سێهەم

## ١- بیردۆزی پەرکەماوی "گەشکە":-

هەندێك کەس ڕازین لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر" *صلی الله علیه وسلم*" کەسێکی ڕاستگۆ و دڵسۆز بووە،بەڵام لەهەمانکاتدا دەڵێن کە پێغەمبەر" *صلی الله علیه وسلم*" ئەشکەنجەی کێشاوە بەهۆی نەخۆشی سەرئێشە" فێ خود گەشکە"لەماوەی ئەم نەخۆشیەدا خوێندویەتەوەو پاشان بووە بەقورئان .

هەندێك لەنوسەران شێوەی پێغەمبەریان وەسفکردووە لەو کاتەی کە نیگای بۆ هاتووە لەگەڵ کەسێك کەتوشی ئەم نەخۆشیە دەبێت.بەڵام ئەم دوو شێوەیە لەیەکتر جیاوازبوون.

بەپێی حەدیث ئێمە ئەوەفێردەبین کە پێغەمبەر" *صلی الله علیه وسلم*" لەیەکێك لەم حاڵەتانەدا نیگای وەرگرتووە:

* لەسەر شێوەی جەرەس.

❖ لەهەندێ كاتدا كەنیگای وەرگەرتووە دەوروبەر زۆرساردبووە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئارەق لە ناوچاوانی هاتۆتەخوارەوە.

❖ هەندێ جار لەكاتی وەرگرتنی نیگا شڵەژاو دیاربووە

❖ لەكاتی وەرگرتنی نیگادا زۆرهەستی بە پەستان دەكرد.

ئەم حاڵەتانە بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ نیشانە پزیشكیەكانی ئەم نەخۆشیە تێكناكەنەوە. "گەشكە" نەخۆشیەكی لەنەكاوەو دەبێتە هۆی شڵەژانی مێشك یان جوڵاندانی جەستە، یاخود هەردوكیان.نیشانەكانی بریتین لە "لەدەست دانی هۆش یاخود بەشێك لەژیری ،ماسولكەكان گرژ دەبن یان جەستە دەلەرزێت بەهۆی ڕەفتاری سەیرلە.٧٠٪ ی ئەوكەسانەی كەتوشی ئەم نەخۆشیە دەبن لە خوار تەمەنی ٢٠ ساڵین ، ئەم نەخۆشیەش نامێنێت كاتێك كەسەكە ئەگاتە تەمەنی هەرزەكاری.

## جۆرەکانی نەخۆشی پەرکەماوی:-

### ١- گەشکەیەکی خراپی گەورە"فێی قورس"

ا-لەرزینـــــی جەســـــتە بەهـــۆی لەدەســـــت دانـــی هۆش"بەئاگایی،هەست" ، دەنگێکی بەرز لەکەسی توشبوو بەرزدەبێتەوەو دەکەوێتە سەر زەوی.

ب-ڕەق بـــوونی جەســـتە و لەرزینــی هەرچـوار پەل ، لەهەنـدێك حاڵەتدا زمان تاڵ دەبێت بەهۆی گرژبوونی ڕوخسار.

ج-لەئەنجامدا کەسی توش بوو سەری لێتێکدەچێت و هەست بەشڵەژان و خەو نەخۆشی دەکات.

د-کەســی توشــبوو هــیچ شــتێکی بیرنـاکەوێتەوە لەوەی کە بەسەری هاتوە.

پێغەمبەر " *صلی الله علیه وسلم* " لەژیانیدا ئەم نیشانانەی تێدانەبوون یاخود بەهۆی ئەم نیشانانەوە نەی ناڵاندووە لەهەمووش گرنگتر

ئەوەیە کە لەدوای نیگا هەموو شتێکی پێش نیگای لەبیربووە و پاشان خوێندویەتە و لەبەری کردوە

## ٢-گەشکەیەکی خراپی کەم"فێی سوك"

ئەم جۆرە لەمنداڵاندا ڕودەدات وە دەمرن لەماوەی پێش هەرزەکاری بێئاگا بوونێکی کاتی(ڕوداوێکی زۆرکورت لە بێ مەیلی) ڕوو لە توشبووەکە دەکات کەبەزۆری لە ١٥ سانیە زیاتر ناخایەنێت.لەکاتێکدا پغەمبەر" *صلى الله عليه وسلم* " لەتەمەنی ٤٠ساڵیدا نیگای بۆهاتووە ، وە هەرماوەی نیگایەك چەند دەقەیەکی خایەن دووە ، ئەمە شتێکی مەحاڵە ئەگەر پێغەمبەر " *صلى الله عليه وسلم* " بە هۆی ئەم ئازارە ئەشکەنجەی کێشابێت.

## ٣-شڵە ژانێکی کاتی لە چالاکی هەستیدا.

ئەم نەخۆشیە لەبەشێك لە مێشکدا ڕوودەدات وە نەخۆشیەکە کاردەکاتە سەرئەو بەشانەی کە ڕەپتن بەم بەشەی مێشکەوەو نیشانەکانی بریتین لە لەرزینی بەشێك لە پەلەکان

"پەنجەکان"یاخود سڕدەبن ودەلەزن .ئەم پەتایەش بەخێرای بڵاودەبێتەوە .

## ٤- لاوازی هۆش و لەبیرچونەوە.

ئەم جۆرانە ڕودەدەن لە ئەدگاری هەست و سۆز یان دەرونندا، کە بۆن و تامێکی ناخۆش یان خەیاڵ کردن لە قەبارە و دوری کەدەبێتە هۆی ترسێکی گەورە ،نەخۆشەکە بێمەیل دەبێت و شتی نامۆدەکات وە ماوەکەشی ١-٣ دەقە دەخایەنێت .لەدوای چاکبونەوە نەخۆشەکە هیچی بیرناکەوێتەوە . دوبارە، پێغەمبەر هیچ کام لەم نیشانانەی تێدانەبوون لەکاتی دابەزینی نیگادا وەك کەسێکی بەئەزموون بینراوە لە لایەن خێزان و هاوڕێکانیەوە.

## هۆکاری پەکەماوی

پەرکەماوی دەرد نیە ،ئەمە نیشانەیەکە"ڕوداوێکە" کەهیچ هۆیەکی تایبەتی لەپشتەوە نیە، نیشانەی ڕاستەقینەی بریتیە لەباش کارنەکردنی شانەی هەستە دەمار لەمێشکدا،شانەکانی

هەستەدەمار چەندین تەزوی کارەبای دەردەپەڕێنن کەدەبێتە هۆی هەڵچون و ناسروشت بوونی خانەکان، ئەنجامەکەشی بریتی دەبێت لە لەرزین و لەدەست دانی بەشێك لە هۆش ،لەسەدا٥٠ ٪ حاڵەتەکانیش هۆکارە سەرەتاییەکانی ئەم نیشانەیە دەتوانرێت دەستنیشان بکرێت بە" برینداربوون لەکاتی منداڵبوون- تەشەنەکردنی نەخۆشیەکان وەکو هەوکردن کەکار دەکاتە سەر شانەکانی دەمار- ژەهراوی بوون –ژێرپەنجەی مێشك – دورکەوتنەوە لە ئەلکحول ،دەرمانی ئازاربەخش – شەکەت بوون"

پێغەمبەر" *صلی الله علیه وسلم*" ئەم نیشانانەی تیادابەدی نەکراوە وە نەخۆشی "گەشکەش"شی نەبوە .ئەو بە کەسێکی جەستە تەندروست و مێشك تەندروست ناسراوە ، هەرچەندە کەوتوەتە نێوچەندان ئازارو مەینەتی بەلاَم وێنەیەکی شازی لەخۆگری نیشانداوە ،قورئان کتێبێکی سەرسوڕهێنەرو نەگۆڕاو شکۆدارە، پزیشکێکی موسوڵمان وتویەتی "ئەگەر قورئان ئەنجامی ئەمە بوایە ، ئەوا خۆشحاڵ دەبوم بەبینی کاسانی تر لەم شێوەیە"

## ٢ - بیردۆزی سەرابی ئاینی :-

ئەوانەی کە بیردۆزی هەست هەڵخەڵە تاندنی ئاینی و تیۆری" بێئاگایی" کاری گەریان لەسەر هەیە ، پێیان وایە کە بنە ڕە ت و بنچینەی قورئـان لە " ئاقـڵ ، زانیـاری ، ئەزمـوون و ژیـنگەی پێغەمبەر" *صلی الله علیه وسلم*" سەرچاوەی گرتووە .

هەرچەندە خۆی لەو ڕاستیە دا ئاگادارنەبووە ، تەنانت هەندێك لە بێباوەڕان "کافرەکان" پێیان وابووە کە پێغەمبەر" *صلی الله علیه وسلم*" شێت بووە" **خوانەکا**" ، بەئاسانی ئەم بیردۆزە ڕەتکراوەتە وە ، پێغەمبەر" *صلی الله علیه وسلم*" بۆماوەی "٢٣" ئامۆژگاری خەڵکی کردووە بە پەیامێکی ڕێك و پێك .

ئەمەش پێچەوانەی ئەو شتەیەکە ، کە کەسێکی شێت بۆماوەی "٢٣" ئەوەندە ڕاست و دروست بێت .

لەلایەکی تر ، کەسی "خەیاڵ پەرست " ناتوانێت بۆماوەی "٢٣" خۆی هەڵخەڵەتێنێ و لە خەیاڵدا بژی ، بەوەی کە نیگای لەلایەن خواوە بۆهاتوە ، ئەگەر ئەم پەیامە لەناخی خۆیدا

هەڵقوڵابێت ، ئەوا قورئـان کۆمەڵە زانیـاریەك لەخۆی دەگرێت کەلە مێشکی مرۆڤـدا سـەرچاوەی نەگرتـووە جـائەو کەسـە چ کەسێکی شێت بووبێت ، بێئاگابوبێت یاخود ژیربوبێت .

١- بۆنمـــونە صـــورەتی "الکهـــف" دابەزیـــوە بـــۆ وەڵام دانەوەی "موشریکاکانی مەککە" کە دەهاتنە لای پێغەمبەر" *صلی الله علیه وسلم*" بۆ ئەوەی تاقی بکەنە وە .

ئەم جۆرە پرسیارانەیان لێدەکرد :-

- خەوتووە کانی ناو ئەشکە وتەکە کێبوون ؟
- چیرۆکی ڕاستەقینەی "خظر" چیە ؟
- چی لەبارەی "ذولقرنین" دەزانی ؟

ئەم سێ پرسیارە پەیوەندیان بە "عیسا و مەسیحیەکان "ەوە بوو ، کە لە نـاوچەی عیجـازدا نەزانـراو بـوون ، ئەم پرسـیارەنەیان کرد بۆئە وەی پێغەمبەر" *صلی الله علیه وسلم*" تـاقی بـکەنە وە ، کە

ئـاخۆ پێغەمـبەر " *صلی الله علیه وسلم* " پـشتی بەهـیچ سـەرچاوەو زانیاری نەبینراو و شاراوە بەستووە .

پێغەمـبەریش" *صلی الله علیه وسلم* " ، پێـێ وتـن بەیـانی وەڵامتـان دەدەمە وە . هەرچەندە ، ئەوان هەموو ڕۆژێ بۆ وەڵامی پرسیارەكان دەهاتنەوە لای پێغەمبەر " *صلی الله علیه وسلم* " ، بۆئە وەی وەڵامی پرسـیارەكانیان دەسـت كەوێـت . بەڵام پێغەمـبەر" *صلی الله علیه وسلم* " ڕۆژ بەڕۆژ دوای دەخـستن هەتـا "١٥" شـەو تێـپەڕی ، هێـشتا نیگای بۆنەهاتبوو ، لە ئەنجامدا خەڵكی مەككە سەرزەنشتی پێغەمبەر یان كرد ،بۆیە پێغەمبەر" *صلی الله علیه وسلم* " هەستی بە پەرێـشان و دڵتەنگـی كـرد بە هـۆی دانەبەزینـی نیگـا كە چاوەڕوانی دەكرد .

لەدوای "١٥" ڕۆژ"***جوبرایل***" دابەزی و نیگـای بـۆ هێنـا وە وەڵامـی پرسیارەكانی پێوت ، هۆكاری ئەم دواكەوتنەش خوا لە قورئاندا ڕونی دەكاتە وە :-

"وَلَا تَقُولَنَّ لِشَيْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا "-" إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ ۚ وَاذْكُرْ رَبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَىٰ أَنْ يَهْدِيَنِ رَبِّي لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا "-"الكهف "٢٣-٢٤"

"هەرگیز دەربارەی هیچ شتێك و هیچ کارێك مەڵێ، من بەڕاستی سبەینێ ئەنجامدەری ئەو کارەم..."ـ")

مەگەر بڵێیت: ئەگەر خوا بیەوێت و ویستی پەروەردگاری لەسەر بێت، یادی پەروەردگاریشت بکەکاتێك کەلەبیرت چوو بڵێیت "ان شاء الله" لەئەنجامدانی هەر کارێکدا بڵێ: ئومێدەوارم پەروەردگارم ڕێنمووییم بکات بۆ بەڵگەیەکی نزیکتر لەمەتا بەو شێوەیەی کەپێی چاکەو لای پەسەندەجێبەجێی بکەم").

هەرچەندە ، دواکەوتنی نیگا بۆ پێغەمبەر" *صلی الله علیه وسلم*" بەئازار بوو ، بەلام لەڕاستیدا هێزو توانای پێبەخشی .

سەختە باوەڕ بکرێت کەچۆن "سەرابی خەیاڵی" یامەتی پێغەمبەری دابێت ، بۆ وەلام دانەوەی پرسیارەکانیان بەڕاستی و بێدەنگ کردنی رەخنە گرەکانی .

ب- سەرەڕای ئەم جۆرە زانیاریانە ، چەندین زانیاری جۆراوجۆر هەیە لە قورئانی پیرۆزدا کە مێشکی مرۆڤ لەو ساتەدا نەیتوانیووە پەی پێبەرێت ، جاج ئەو مرۆڤە کەسێکی بە "ئاگابووبێت ، بێئاگا یاخود بێهۆش"

بۆنمونە قورئان ئەم زانیاریان لەخۆدەگرێت :-

رووداو ڕاستی مێژوویی كە بۆ پێغەمبەر و سەردەمی پێغەمبەر" *صلى الله عليه وسلم*" نە زانراو بوون وەكو:-

- " چیرۆكی ذولقەرنەین- شاری احرام"
- چەندان پێشبینی سەبارە ت بەداهاتوو كە هاتونە جێ.
- چەندین ڕاستی زانستی كە نەزانراو بوون ، وە سەدان ساڵ لەدوای دابەزینی قورئان ئاشكرا بوون.

# بەشی چوارەم

## قورئان لە ئینجیل وەرگیراوە .

زۆرێـک لە ڕەخنەگـران دەڵـێن «پێغەمـبەر" صلی الله علیه وسلم" خـۆی دانەری قورئـان نـیە ،بەڵام لەسـەرچاوەکانی تـری مـرۆڤ فێربووە ، وەریگرتووە لە پەڕواوە ئاسمانیەکانی تر .

١- پێغەمـبەر" صلی الله علیه وسلم" قورئـان لە ئاسـنگەرێکی ڕۆمانی فێربووە کە "مەسیحی"بووە .

هەنـدێك لەبت پەرستەکان پێغەمـبەر" صلی الله علیه وسلم" بەوە تـاوان بـاردەکەن ، کە قورئـان لە ئاسـنگەرێکی ڕۆمـانی فێربووە ،کەخـاوەنی بیروبـاوەڕی مەسـیحی بـووە و لەدەورو بەری مەککە ژیاوە . پێغەمبەر" صلی الله علیه وسلم" بەزۆری سـەردانی کردووە و سە یری کارەکەی کردووە .

بەڵام قورئان لە وەڵامی ئەمەدا دەڵێت :-

"وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُبِينٌ "-"النحل :١٠٣"

("سوێند بەخوا ئێمەبەڕاستی دەزانین بۆ باوەڕیان دەڵێن: ئەم قورئانەتەنها کەسێك فێری دەکات، "بەمەر جێك" زمانی ئەو کەسەی ئەوان دەڵێن قورئان فێری محمد دەکات، عەجەمیەو عەرەبی نیەو ڕەوان نیە، لەگەڵ ئەوەدا ئەم قورئانەبەزمانی عەرەبی و پاراوو ڕوون و ئاشکرا داڕێژراوە").

چۆن کەسێکی بیانی کە ناتوانێت باش بەعەرەبی قسە بکات و خاوەنی عەرەبیەکی سادەبێت ،ببێت بەسەرچاوەی قورئان لەکاتێکدا ، قورئان خاوەنی زمانێکی پاراو ڕەوانبێژە

"زۆر باشە عەرەب " کە باوەڕت وایە ئاسنگەرێك پێغەمبەری" *صلی الله علیه وسلم*" فێرکردووە .

تەنها وەکو ئەوە وایە کە کەسێکی چینی کۆچ بکات بۆ ئینگلتەرا کە خۆی باش ئینگلیزی نازانێت پاشان شکسپیر فێری ئینگلیزی بکات .

ب- پێغەمبەر" *صلى الله عليه وسلم* " قورئان لە وەرەقە فێر بووە" *ئامۆزای خەدیجە* "

پەیوەندی نێوان پێغەمبەر و زانا مەسیحی و جولەکەکان زۆر کەم "سنوردار"بووە دیارترەین مەسیحی بریتی بوو لە" ***وەرەقەی کوڕی نوفل*"** کە کە سێکی کوێر و پیربوو . هەروەها ئامۆزای خەدیجەی خێزانی پێغەمبەر بوو ." *صلى الله عليه وسلم* "پسپۆڕ بوو لە "نیو تێستامێنت"بەشی دووەمی ئینجیل "

پێغەمبەر" *صلى الله عليه وسلم* "دوجار وەرەقەی بینیوە ، یەکەم جار؛ کاتێك وەرەقە خەریکی ئەنجامدانی پەرستش بوو لە نزیك"کەعبە" بەرلە بوونی بە پێغەمبەر ، بەمیهرەبانیە وە ناوچاوانی پێغەمبەری ماچ کرد . جاری دووەم؛ پێغەمبەر" *صلى الله عليه وسلم* "وەرەقەی بینی لەدوای دابەزینی نیگا . "٣" ساڵ دوای

دابەزینی نیگا وەرەقە کۆچی دوای کرد لە کاتێکدا نیگا بۆماوەی "۲۳" ساڵ بەردەوەم بوو .

ئاینی پێغەمبەر *"صلى الله عليه وسلم"* گفتوگۆ لەگەڵ جولەکە و مەسیحیەکان دەکات .

ڕاستە پێغەمبەر *"صلى الله عليه وسلم"* گفتوگۆی لە گەڵ مەسیحی و جولەکەکان هەبووە ، بەڵام ئەم گفتەگۆیانە لە شاری مەدینە بوە لەدوای "۱۳"ساڵ لەهاتنە خوارەوەی نیگا.

بەڵگەی ئەوەی کە مەسحی و جەلەکەکان سەرچاوەی قورئان بوون یان پێغەمبەریان فێرکردووە ، ڕاستنیە و بەپێچەوانە وە ، لەم جۆرە گفتوگۆیانەدا پێغەمبەر *"صلى الله عليه وسلم"* مامۆستایان بووە بۆ بانگهێشتنیان بۆ سەرئاینی ئیسلام کە دوور کەوتبوونەوە لەیەك تاپەرستی. پاشان زۆرێك لەوانە ئیسلامیان قوبوڵکردو موسوڵمان بوون .

پێغەمبەر *"صلى الله عليه وسلم"* فێری قورئان بووە لە *"جولەکە و مەسیحیەکان"* لەدەرەوەی نیمچە دورگەی عەرەبی .

ســەرجەم تۆمــارکراوە مێژووییەکــان ئەوە نیــشان دەدەن کە پێغەمبەر" *صلى الله عليه وسلم* " بەرلەبوونی بە پێغەمبەر "*صلى الله عليه وسلم* " سێگەشتی بۆ دەرەوەی مەککە کردووە .

- لەتەمەنی"٦" ساڵێدا لەگەڵ دایکی ڕۆیشت بۆ شاری مەدینە .

- لەنێوان تەمەنی "٩-١٢"ساڵێدا لەگەڵ مامی "ابوطالیب"ڕۆیشت بۆشام"سوریا"لە گەشتێکی بازرگانیدا.

- لەتەمەنی"٢٥" ساڵێدا بوە سەرۆکی کاروانی "*خەدیجە*" بۆ سوریا"شام"

ئەوە خەیاڵێکی گەورمیە ئەگەر بووترێت، قورئان بەرهەمی ئەو کۆبنەوانەیە کە پێغەمبەر" *صلى الله عليه وسلم* " لەگەڵ مەسیحی و جولەکەکانــدا کردویەتــی ، یــاخود لە گەشتەکانیدا.

هـ-هۆکارە لۆژیکیەکان کەدەی سەلمێنن پێغەمبەر" *صلى الله عليه وسلم* " قورئان لە مەسیحی و جولەکە کان فێرنەبووە .

ڕۆژیە ڕۆژ ژیانی پێغەمبەر" صلی الله علیه وسلم "کتێبێکی کراوە بووە بۆئەوەی هەموان ببینن ، لەڕاستیدا نیگا بۆئەوە هاتووە تاداوا لەخەڵك بکات، بۆئەوەی هەندێك تایبەتمەندی بدەن بە پێغەمبەر" صلی الله علیه وسلم ".

ئەگەر پێغەمبەر" صلی الله علیه وسلم "کۆبونەوەی لەگەڵ خەڵکی هەبوایەو پێیان وتبا ئەمە بکە بەنیگا ، ئە وا ئەم کارە بۆماوەیەکی ئەوەندە درێژ نەی دەتوانی خۆی بشارێتەوە.

دیارترین خانەدانەکانی قورەیش کە ئیمانیان هێناوە و ئیسلامیان قبوڵکردووە ، کەسانی زیرەو ژیربوون. ئەوان زۆر بەئاسانی دەیان توانی دەرك بەڕاستی بکەن و هەرشتێك کە جێگەی گومان بێت لە وەی کە پێغەمبەر" صلی الله علیه وسلم "پێیان دەڵێت لەماوەی "٢٣"ساڵی دابەزینی نیگادا.

نەیارانی پێغەمبەر" صلی الله علیه وسلم " لەنیزیکە وە سەیری پێغەمبەر و کارەکانیان کردوە، بۆ ئەوەی تاکە بەڵگەیەك بدۆزنەوە بۆ بانگەشەکەیان ،کە کەسێکی "درۆزنە" بەلام نەیانتوانی بەڵگەیەك بدۆزنەوە کە پێغەمبەر" صلی الله علیه

وسلم" كە تاكە كۆبونەوەیەكی لە گەڵ مەسیحی و جولەكەكان هەبوبێت.

ئەمە شتێكی نەگونجاوە بۆهەركەسێك كە نوسەری قورئان بێت وە ئەم حاڵەتەشی قبوڵ كردبێت بە بێ بوونی هیچ بنەڕەت و سەرچاوەیەكی قورئان .

بەم شێوەیە ، ج لەڕوی مێژووەوە ج لەڕوی ئە قڵ و ژیریەوە ناتوانرێت دابنرێت ، كە سەرچاوەی مرۆیی هەبووبێت بۆقورئان.

و- پێغەمبەر" صلی الله علیه وسلم" نەخوێندەوار بووە .

ئەو تیۆرەی كە دەڵێت پێغەمبەر" صلی الله علیه وسلم" دانەری قورئانە یاخود لەسەر چاوەكانی تر وەری گرتوە .تەنها بەیەك ڕاستی مێژویی بەدرۆدەخرێتەوە كە بریتیە لەوەی پێغەمبەر" صلی الله علیه وسلم" نەخێندەواریوە .

خواخۆی لەقورئان شایەتی دەدات:-

""وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِنْ قَبْلِهِ مِنْ كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذًا لَارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ "-"العنكبوت :٤٨

("تۆ ئەی پێغەمبەر "صلی اللەعلیەوسلم"پێش ناردنی ئەم قورئانەهیچ كتێبێكت نەدەخوێندەوە، بەدەستی خۆیشت هیچ شتێكت نەنووسیووە، "چونكەنەخوێندەوار بوویت"خۆ ئەگەر شتێكی وات ئەنجام بدایە، لەو كاتەدا نەفام و دەم بەتاڵەكان دنیایان پڕ دەكرد لەشك و گومان كەگوایەقورئان لەدانان و داڕشتنی تۆیە").

خوا دەیزانی كەزۆرێك لەمرۆڤەكان گومان لە ڕستیەتی قورئان دەكەن ،وە دەیدەنە پاڵ پێغەمبەر" *صلى الله عليه وسلم* "بۆیە خوای گەورە دواهەمین پەیامبەری خۆی هەڵبژارد بە "نەخوێندەواری"بۆیە هیچ كەس بیان وپاساوی نیە كە گومانی لە پێغەمبەر" *صلى الله عليه وسلم* "هەبێت.

ئەم تۆمەتەی نەیارانی كە گوایە پێغەمبەر" *صلى الله عليه وسلم* " قورئانی لەسەر چاوەكانی تر وەرگرتووە ،پاشان دایڕشتۆتەوە بە زمانێكی جوان و سەنگێكەوە ، خوای گەورە دوپاتی دەكاتەوە :-

"الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ أُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ "-"الأعراف :١٥٧"

("ئەوانەی کەشوێنی ئەم "محمد"صلی الله علیه وسلم" پێغەمبەرەهەواڵدەرنەخوێندەوارەدەکەون ئەوەی کە"گاورو جوو، ناوو نیشانیان" دەستیان دەکەوێت نووسراوەلای ئەوان لەتەورات و ئینجیلدا، فەرمانیان پێدەدات بەچاکەو قەدەغەی گوناهو خراپەیان لێدەکات و هەرچیەك پاکو چاکەبۆیان حەلال دەکات و هەرچی پیس و ناپوختەلێیان حەرام دەکات و ئەرکەقورس و سەنگینەکان لەسەرشانیان لادەبات، ئەو کۆت و زنجیرانەش کەلەسەریان بوو لای دەبات "وەك خۆ کوشتن لەکاتی تەوبەدا... هتد"، جا ئەوانەی باوەڕیان پێ هێناوەو پشتیوانیان لێکردوەو پشتگیریان کردووەو شوێنی ئەو نوورەکەوتوون "کەقورئانە)" و هاوڕێ لەگەڵیدا ڕەوانەکراوە، هەر ئەوانەسەرفرازو ڕزگارن").

هەروەها لە ئنجیلیشدا ئاماژە بەوە کراوە کە ئەو پێغەمبەرەی دێت "نەخوێندەوارە"

"کتێبی""Isaiah"١٢"٢٩"

قورئـان زیـاتر لە "٤" شـوێندا ئامـاژ بەنە خوێنـدەواری پێغەمـبەر" صلی الله علیه وسلم" دەکات.

"قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ-لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْيِي وَيُمِيتُ-فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَكَلِمَاتِهِ وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ "-"الأعراف :١٥٨"

("ئەی محمد"صلی الله علیه وسلم" بڵێ: ئەی خەڵکینەبەڕاستی مـن پێغـەمبـەرو فرسـتادەی خـوام بـۆ ئێوەبـەگشتی، ئـەو خوایـەی کـەهـەر بۆئـەوەخـاوەنـدارێتی ئاسـمانەکـان و زەوی، هـیچ خوایـەك نیەجگـەلەو زاتە، دەژێنێت و دەمرێنێت، جا کـەوابوو باوەڕی پتـەو بهێـنن بـەو خوایـەو بـەپێغـەمبـەرەکـەی، کـەهـەواڵـدەرێکـی نـەخوێنـدەوارە، "تـاهیچ کـەس نـەڵێت پیـاوێکی خوێنـدەوار بـووەو خۆی قورئـانی دانـاوە" ئـەو پێغـەمبـەرەی کـەخـۆی بـاوەڕ دەهێنێت بـەخـواو بـەفـەرمـوودەکـانی، دەئێوەش شوێنی بکـەون، بۆ ئـەوەی ئێوەڕێنموویی وەرگرن").

"هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا مِنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ "-"الجمعة :٢"

("هەر ئەو زاتەیەلەناو خەڵکێکی نەخوێندەواردا پێغەمبەرێکی لەخۆیان ڕەوانەکرد، ئایەتەکانی قورئانەکەی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوەو دڵ و دەروون و ڕواڵەت و ئاشکرا و نادیاریسان پوختەدەکات، فێری قورئان و دانایی و شەریعەتیان دەکات، بەڕاستی ئەوانەپێشتر لەگومڕایی و سەرلێشێواویەکی ئاشکرادا گیریان خواردبوو").

ی- چاپی ئینجیل بەزمانی عەرەبی لەو سەردەمەدا بونی نەبوو؛

ئەم چاپە عەرەبیەی ئینجیل کەئێستا هەیە بەزمانی عەرەبی ،لەسەردەمی پێغەمبەردا بونی نەبووە. "ئۆڵد تێستامنت" بەشی یەکەمی کتێبی پیرۆز" بەزمانی عەرەبی هاتۆتە کایەوە لە٩٠٠ زاینی لەلایەن "ڕابی سادیەس گۆن "بە "٢٥٠"ساڵ لەدوای مردنی پێغەمبەر" صلی الله علیه وسلم"

کۆنتیرین چاپی عرەبی"نیو تێستامێنت "بەشی دوومی کتێبی پیرۆز" بڵاوکراوەتەوە لەلایەن "ئێرپینس"لە ساڵی ١٦١٦زاینی سەدان ساڵ لەدوای مردنی پێغەمبەر" *صلی الله علیه وسلم"*

ح- لایەنە لێکچوەکانی قورئان و ئینجیل "سەرچاوەی هەردوکیان یەکە"

لایەنی لێکچون لە نێوان قورئان و ئینجیلدا مانای ئەوە نیە کە قورئان لە ئینجیل وەرگیراوە. لەڕاستیدا ، ئەمە بەڵگەیەکە کەسەرچاوەی هەردوکیان نیگای ئاسمانیە "خوایە"هەموو نیگاکان یەك سەرچاوەن و لەیەك سەرچاوە هاتوون "لەلایەن یەك خوا"

گرنگ نیە کەشوێنکەوتوانی ئاینەکانی پێشتر پەڕاوە ئاسمانیەکانیان گۆڕیون و شێواندویانن لەسەر شێوە بنەڕەتیەکەی خۆیان.

ئێستا ئەمانە ماونەتەوە لەزۆربەی بەشە کانی جیهان ، سەرچاوەن بۆگەلێك لەئاینەکان .

ئەوە ڕاستە لە قورئـان و ئینجیلـدا هەنـدێك پـایە هەن کە وەکو یەکن یان لێکچون

بەڵام ئەمەش واتای ئەمە نیە کە پێغەمبەر" *صلی الله علیه وسلم* " قورئانی لە ئینجیل وەرگرتووە و پاڵاوتویەتی

هەروەك چـۆن ناتوانرێـت بوترێـت کە عیـسا پەیـامی لە "ئۆڵـد تێستامێنت"وەرگرتووە ،وە پێغەمبەرێکی بێ وێنە نیە "***خوانەکا***"

لایەنە لێکچووەکـــانی قورئـــان و ئینجیـــل ئەوە دەردەخەن کە هەردوکیان لەلایەن خوایەکی ڕاستە قینەو بەردەوام بونی پەیـامی بـاوەڕبونی یەك خـواییە. نەك بەواتـای ئەوەی کە هەر پێغەمبەرێك پەیامی لە پێغەمبەری پێش خۆی وەرگرتووە.

ئەگەر کەســێك غەش بکــات لەســەر وەرەقەی تــاقیکردنەوە ناتوسێت لە جیرانەکەم وەرگرتووە .

پێغەمــبەر" *صلی الله علیه وسلم* " ڕێــزی لەســەرجەم پێغەمــبەران گرتووە و باوەڕی پێیان هەبووە .قورئانیش ئاماژە بەوە دەکات کە خوای گەورە پەیامی جیاوازی بۆ پێغەمبەران ناردوە.

(خ)- موسوڵمانان باوەڕیان بە "قورئان، ئینجیل، زەبور، تەورات" هەیە .

ئەم چوار پەڕاوە ئاسمانیە لەقورئـانی پیـرۆزدا ئاماژەیـان پێکـراوە ،تەورات بۆ موسا، زبور بۆ داود ، ئینجیل بۆ عیسا وە قورئـانیش بۆ پێغەمبەر "-ﷺ" *صلى الله عليه وسلم* ".

یەکێك لەپایەکانی ئاینی ئیسلام ئەوەیە کە ئەبێت موسوڵمان باوەڕی بەسەرجەم پەڕاوە ئاسمانیەکان هەبێت، لەم ڕۆدا پێنج جۆر ئینجیل هەیە.

لەوانەیە لەم کتێبـانەدا وتەی خواهەبێـت، بەڵام ئەم کتێبـانە هەمان کتێب نین کە خوای گەورە بۆ پێغەمبەردەکانی ناردوون ، قورئـان ئامـاژە بەیەکریـزی و برایەتـی سـەرجەم پێغەمـبەران دەکات.لەبەرئەوە، بنچینەی فێرکردنی باوەڕی ڕستەقینەدژیەك و پێچەوانە نابێت .

هەرچەنـدە، لەوانەیە مـاوەو کـاتێکی زۆر لەنیـوان پێغەمبەرانـدا هەبوبێـت، بەڵام سـەرچاوەی ئەرك و پەیامەکەیـان بریتـی بـووە لەیەك "***خوا***"

ئەمانەش لەبەرئەوەیە کە قورئان دەڵێت ئەوجیاوازیەی کەلەنێوان ئاینەکانـدا هەیە پێغەمبەرەکـان لێـی بەرپرسـیارنین ،بەڵام ئەوە شـــوێنکەوتەی پێغەمبەرەکـــانن کە لەبیریـــانچووە کە پێغەمبەرەکانیان چیان فێرکردوون .

ســەرەڕای ئەمەش ، بەهەڵەتێگەیـشتون و پەڕاوەئاسـمانیەکانیان گۆڕیـوە ،قورئـان هـیچ پێـشبڕکێ ودژیەکـی لەگەڵ"موسا-عیسا" پێغەمبەرەکانی تر نیە . بەپێچەوانەوە، قورئان ئەوە دەسەلمێنێت و دەچـــسپێنێت کە ئەوان بۆخەڵکەکانیـــان هێناوە،یەکێـــك لەناوەکـانی قورئـان بـریتیە لە "فورقـان" بەواتـای " جیـاکردنەوەی حەق لە باطـــل" ئەوە ئـــێمەین کەبڕیـــاردەدەین کـــامە وتە لە پەڕاوانەی کەئێستاهەن بەوتەی خوا هەژمار دەکرێن.

# بەشی پێنجەم

## بەراوردێکی زانستی لەنێوان قورئان و زانستدا

### أ-دروست بوونی جیهان لەماوەی شەش ڕۆژدا؛-

بەپێی ئینجیلی "دروستبوون"جێنسس" بەشی یەکەم ،جیهان دروست بووە لەماوەی شەش ڕۆژدا، هەر ڕۆژێکیش بیست و چوار کاتژمێر بووە.

لەگەڵ ئەوەشدا، قورئان باس لەدروست بونی جیهان دەکات و دەڵێت لەشەش "ایام"دا ئەمە کۆی وشەی "یوم" کەدوو واتای هەیە.

یەکەمیان؛ "٢٤" کاتژمێر، دووەمیان؛ ئەم وشە عەرەبیە بەواتای "قۆناغ" ماوە" چەرخ" دێت ، "واتە ماوەیەکی زۆردورو درێژ" لێرەدا قورئان ئاماژە بەدروست بوونی ئاسمان و زەوی دەکات،لەماوەی شەش"چەرخ"دا ماوەیەکی دورودرێژ. کەزانایان هیچ بەرهەڵستیەکیان نیە،بەپێی زانست ماوەی دروست بوونی زەوی بلیۆنان ساڵی پێچووە ، کە پێچەوانەیە لەگەڵ چەمکی دروست

بونی جیهان لە ئینجیلدا، كەدەڵێت دروست بوونی جیهان شەش ڕۆژی خایاندووە.

ب- خۆر دروست بووە پاش دروست بوونی ڕۆژ.

ئینجیل لە كتێبی "دروستبوون "جێنسس"بەشی یەكەم خەتی "٣-٥" دەڵێت. ڕۆژ و شەو دروست بوون لەیەكەم ڕۆژی دروستبووندا، ڕوناكی لەجیهاندا بڵاودەبێتە وە لەئەنجامی ئاڵۆزی ئەستێرەكان.

بەپێی كتێبی"دروستبوون " لە بەشی یەكەمدا خەتی"١٤-١٩" خۆر لە ڕۆژی چوارەمدا دروست بووە ، ئەمە شتێكی ناواقیعیە كە ئاماژەبكرێت ڕوناكی دروست بووە لەیەكەم ڕۆژی دروست بووندا،لە كاتێكدا، هۆو سەرچاوەی ڕوناكی دوای سێ ڕۆژ دروست بووە ، هەروەك لە ئینجیلدا ئاماژەی پێكراوە .

زیاتریش بونی بەیانی و ئێوارە وەكو بەشێك لەڕۆژ، دەبێت لەدوای دروست بوونی زەوی بوبێت وە خولانەوەی بەدەوری خۆردا.

ئەگەر بڵێی پێغەمبەر " *صلی الله علیه وسلم* " شێوازی دروست بونی جیهانی لە ئینجیل وەرگرتووە ، کەواتە لەبیری چووە ئەم ئەنجامە نازانسیانە وەربگرێت"کۆپی بکات" .

ج- دروستبونی " *زەوی ،خۆر و مانگ*"

ئێمە ئاگادارین و دەزانین کە کە زەوی و مانگ هەڵقولاوی ئەستێرەی بنەڕەتین کە "خۆر"ە،لەگەڵ ئەوەشدا،بە پێی ئینجیل لەکتێبی"دروستبوون"جێنسس"بەشی یەکەم ،خەتی"٩-١٣"کە زەوی دروست بووە لە سێهەمین ڕۆژی دروستبووندا،وە بەپێی ئەم چەند خەتانە"١٤-١٩" خۆرو مانگ دروست بوون لەچوارەمین ڕۆژی دروستبوندا.

بەم شێوەیە، بەپێی ئینجیل خۆر دروست بووە بە لەدوای دروستبونی زەوی کەپێچەوانەیە، لەگەڵ بیرۆکەی پێکهاتنی سیستەمی خۆری.

أ- گۆرگیا دروست بووە لە سێهەمین ڕۆژی دروستبوندا وە خۆریش لە چوارەمین ڕۆژدا.

بەپێی کتێبی"دروسبوون"جێنسس" بەشی یەکەم خەتی"١١-١٣"

گژوگیا دروستبووە لە سێهەمین ڕۆژی دروستبوندا، خۆریش دروست بووە لە چوارەمین ڕۆژی دروست بووندا.

ئەگەر"پێغەمبەر" صلى الله عليه وسلم" نوسەری ڕاستەقینەی قورئان بوبێت ،ئەوە تەنها لە ئینجیل وەریدەگرت،

چۆن نەی توانی خۆی لەهەڵە زانستی و زانیاریەکان دورخاتەوە کەلە ئینجیلدا بونیان هەیە،قورئان هیچ وتەیەکی تێدانیە کە نەگونجاوبێت لەگەڵ هۆکارو دەقە زانستیەکان

(٥)-خۆر و مانگ هەردوکیان ڕوناکی دابەش دەکەن.

بەپێی ئینجیل خۆرومانگ هەردوکیان ڕوناکیەکانیان پەخشدەکەن.کتێبی "دروستبوون"جێنسس"بەشی یەکەم خەتی"٦"دەڵێت.

"خوا دوو ڕوناکی گەورەی دروستکردوە" بەهێزەکە بۆڕوناك کردنەوەی زەوی و ئەوی تر بۆڕوناك کردنەوەی شەو،

ئەمرۆ، زانست پێمان دەڵێت ،مانگ خاوەنی ڕوناکی خۆی نیە، ئەمەش چەمکی قورئان دەسەلمێنێت، مانگ ڕوناکی لە خۆر وەردەگرێت. کەواتە ، پێغەمبەر" *صلى الله عليه وسلم*" ١٤٠٠ ساڵ ئەو هەڵە زانستەیەی ڕاستکردۆتەوە کەلە ئینجیلدا بونی هەیە،ئەگەر پێغەمبەر" *صلى الله عليه وسلم*"ئەمەی لە ئینجیل وەرگرتبا ئەوا ئەم هەڵەیەی ڕاست نەدەکردەوە.

و- ئادەم یەکەمین پیاو لەسەر زەوی"٥٨٠٠" ساڵ لەمەوبەر.

ئەگەر کەسێك "بۆماوەزانی"یەکەمین پیاو بخوێنێت لەسەر زەوی ،"ئادەم ،ابراهیم . عیسا،"هە روەك لە ئینجیلدا ئامازەی پێکراوە کە ئادەم نزیکەی "٥٨٠٠"ساڵ لەمەوبەر بونی هەبوە لەسەر زەوی. سەیرکە ؛

- ١٩٤٨ ساڵ لەنێوان ئادەم و ابراهیم
- نزیکەی ١٨٠٠ ساڵ لەنێوان ابراهیم و عیسا
- ٢٠٠٠ساڵ لەنێوان عیسا و محمد

لێـرەدا، بەڵـگەی زانـستی لە "شـوێنەوار و مرۆڤناسـدا"بـاس لەوەدەکەن کە یەکەمـین مـرۆڤ لەجیهانـدا هەزاران هەزار سـاڵ لەمەوبەر بووە نەك ئەوەی کەلە ئینجیلدا باسکراوە.

لەکاتێکـدا، قورئـان بـاس لەئـادەم دەکـات کەیەکەمـین مـرۆڤ بوە لەسەر زەوی ،وەباس لەکات و ساتی ئادەم لەسەر زەوی ناکات ،بەپێچەوانەی ئینجیل کەلەگەڵ زانست گونجاو نیە.

ی- نوح و لافاوەکە:-

کتێبـی"دروسـتبوون"جێنـسس" وەسـفی لافـاوەکەی نـوح دەکـات ، لەبەشـکانی "٦-٧-٨"کە ئەم لافـاوە لافـاوێکـی جیهـانی بـووە، وە هەمـوو شـتێکی زینـدوی تێکـشکاندووە، جـگە لەوانەی کە لەگەڵ "نوح"بوون لەناو کەشتیەکەدا.

لەم وەسفکردنەدا وادەردەکەوێت کە ١٦٥٦پاش دروسـتبونی ئادەم بووە ، وە ٢٩٢٠ساڵ پێش دروستبونی ابراهیم بووە.

کاتێك نوح تەمەنی ٦٠٠ سـاڵ بووە ، لافاوەکە ڕویداوە،لە سەدەی "٢١-٢٢"پ.ز

ئەم چــــرۆکە "لافـــــاوەکە"دژی بەڵـــــگە زانـــــستیەکانە لە سەرچاوەکانی شوێنەوار، وەسفکردنی قورئـان بۆ چیرۆکەکەی "نـوح" هاوتــایە لەگەڵ بەڵـگەی زانـستی واتە"هـیچ دژیەکـی تێدانیە" چونکە ؛

یەکەم: قورئـان باس لە کاتی تایبەت سەبارەت بە کات و ساتی لافاوەکە ناکات.

دووەم؛ قورئــان بــاس لەوەناکــات کەئەم لافـاوە جیهـانی بـووە و هەمـوو شتێکی زیندووی تێکشکاندووە .قورئـان بەشـێوەیەکی تایبەت دەڵێت لافاوەکە تایبەت بووە بە خەڵکەکەی نوح.

ئەمە شـتێکی نـاواقیعی و نـالۆژیکیە ئەگەر بوترێت پێغەمـبەر" صلی الله علیه وسلم" قورئانی لە ئینجیل وەرگرتوە .

ج- چیرۆکی فیرعەون و کۆچکردنەکەی موسا.

چیرۆکـی فیـرعەون و کـۆچکردنەکەی موســا، زۆر نـزیکە لە قورئــان، هەردوو پەڕاوە ئاســمانیەکان ڕازیــن لەســەر ئەوەی کە فیـرعەون خنکـا لەکـاتی دواکەوتنـی بەدوای موسـادا کاتێـك

کەبەنوایسراپیلەکان لەئاوەکەدا پەڕینەوە ئەوەی کەگرنگە ئاماژەی پێبکرێت لێرەدا ئەوەیە ،کەقورئان زانیاری زیاتر دەدات.

خوای گەورە دەفەرموێت:-

"فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ آيَةً ۚ وَإِنَّ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ عَنْ آيَاتِنَا لَغَافِلُونَ "-"یونس :۹۲"

("ئەمڕۆ ئیتر لاشەی تۆ ڕزگار دەکەین تا ببێتەموعجیزەو پەند و ئامۆژگاری بۆ ئەوانەی دوایتۆ دێن "دیارەخوای گەورەپاراستویەتی لەوەی کەماسی بیخوات، شەپۆلی دەریا کەیاندیەکەنار، تا ئەوانەی کەبەخوایان دەزانی بەچاوی خۆیان ببینن کەفیرعەون ئادەمیزادێکەوەك ئەو خەڵکەو ببێتەپەند، بۆ هەموو پاشاو زۆردارەکانی سەر زەوی کەئەوسەرئەنجامی مسۆگەری هەموویانە". بەڵام بەڕاستی زۆریەی خەڵکی لەئایەت و موعجیزەکانی ئێمەغافڵ و بێئاگان").

نمونەیەکی ئاوا لە ئینجیلدا بونی نیە.

دکتۆر"ماوریس بوکایل"دەڵێت لەدوای توێژینەوەیەکی تەواو سەبارەت بە"ڕامسیسی دووەم" کە ویستویەتی اسرائلیەکان ڕازیبکات وە لەو کاتەدامردوە کاتێك موسا پەنایبردوەتە شاری مەدیەن.

کوڕی "ڕامسیسی دووەم" لەدوای باوکی بوە بە فیرعەون، کەناوی"مێرنیپتاە"بووە. وە "مێرنیپتاە"بوو خنکا لە کاتی دواکەوتنی موساوە لە ساڵی "١٨٩٨"جەستەکەی دۆزرایەوە لە "دۆڵی پاشاکانی میسر".

لە ساڵی"١٩٧٥"دکتۆر" ماوریس بوکایل" لەگەڵ دکتۆرەکانی تر، مۆڵەتیان خواست بۆپشکنینی جەستەکەی لە ئەنجامدا سەلماندیان کە ئەم کەسە خنکاوە یاخود لە پێکدادانێکی خێرادا مردوە.

بەم شێوەیە لە قورئاندا ئایەتێك هەیە دەڵێت " ئێمە وەکو ڕەمزێك ئەم جەستەیە دەپارێزین"

ئێستا جەستەکە پارێزاوە لە مۆزەخانەی میسر لە "قاهیرە" ئەم ئایەتەی قورئان توێژینەوەی دکتۆر" ماوریس بوکایل" پشت ڕاست دەکاتەوە، ئەم دکتۆرە مەسیحی بووە، پاشان کتێبێکی نوسی

بەنــاوی" ئینجیل:قورئان:زانـست"ڕایگەیانـد کەهـیچ کەسـێك نوسـەری قورئـان نـیە، جـگە لە "الـله"کە بـنەڕەت و سـەرچاوەی هەموو شتێکە بەم شێوەیە ئیسلامی قوبوڵکرد.

سـەرجەم ئەم بەڵگـانە ئەی سـەلمێنن کە قورئـان لە ئینجیـل وەرنەگیـراوە، بە پـێچەوانەوە قورئـان بـریتیە لە "فورقـان" بنەمـای جیـاکردنەوەی ڕاستی لە ناڕاسـتی.وە ئەوە قورئـانە کە بڕیـاردەدات کامە بەشەی ئینجیل وتەی خوایە.

"وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَاءَكَ مِنَ الْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنْكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَٰكِنْ لِيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ ۖ فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ ۚ إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ "-"المائدة :٤٨"

("ئێمەقورئانمان هاوڕێ لەگەڵ هەموو حەقیقەت و ڕاستیەکدا بۆ تۆ دابەزاندووە، ڕاستی و دروستی کتێبەکانی پێش خۆیشی دیاری دەکات و چاودێرەبەسەر هەموویاندا "کاتێك خاوەنانی کتێب لەگاورو جوو گیروگرفتیان دەهێنن بۆ لای تۆ" بەو بەرنامەیەی خوا ناردوویەتی داوەریی بکەلەنێوانیانداو شوێن ئارەزووەکانی ئەوان مەکەوەو لەو حەقەلامەدەکەبۆت ڕەوانەکراوە، بۆ هەرلایەکتان "موسڵمانان و خاوەنانی کتێب" بەرنامەو پرۆگرامی تایبەتمان بڕیارداوەخۆ ئەگەر خوا

بیویستایەهەر هەمووتانی دەکردەیەك ئوممەت و گەلێکی یەك پارچە، بەڵام "ویستی وایەبەو جیاوازیە" تاقیتان بکاتەوەلەوەی پێی بەخشیوون "تا بەهۆی عەقڵ و ژیریتانەوەشوێنی پێغەمبەری ئیسلام بکەون"، دەی کەواتەزۆر بەپەلەبن و پێشبڕکێ بکەن بۆ هەموو خێرو چاکەیەك، دڵنیاش بن کەهەمووتان دەگەڕێنەوەبۆ لای خوا، ئەو کاتەهەواڵی تەواوتان دەداتێ دەربارەی ئەو شتانەی کەکێشەتان لەسەری هەبوو").

# بەشی شەشەم

## ١- قورئان وەكو كتێبی چیرۆك نیە.

بەپچەوانەی كتێبە ئاسمانیەكانی تر ، قورئان ڕوون و بێهاوتایە لەشێوازی گێڕانەوەی مرۆڤ ،هەموو كتێبێكی ئاینی جگە لە قورئـانی پیـرۆز" شـێوازی گێـڕانەوە پەیڕەودەكـات ، كەهاوتـایە لەگەڵ كتێبی چیرۆك.

شێوەو شێوازی كتێبی چیرۆك بریتیە لە؛"جارێك لەجاران ، ڕێویەك و هێشوەترێیەك یان بەرخ و گورگەكە...هید" .

ئەمـانە هاوشێوەی تایبەت مەندیەكانی كتێبی چیرۆكن" جارێك لە جاران ئەمە ڕویدا" هەمـوو پەڕاوە ئاینیەكـان سـەرەتاو كۆتاییـان هەیە .گێـڕانەوەی ڕووداو هۆكـارە مێژوییەكـان پەیـوە نـدیەكی ڕێك و پێكیـان پێكەوە هەیە. بەم شێوەیە مرۆڤەكان دەدوێن و قسەدەكەن.

قورئان كتێبێكی بێهاوتایە ، ئەو ئایەتانەی كەسەرەتا دەبەزیون ئەوە فەرمانی خوان ؛ كەدەفەرموێت :- "بخوێنە" -"بەناوی ئەوخوایەی كەمرۆڤی دروست كردووە "قورئان بە شێوەیەكی گێڕانەوە دەست پێناكات .

❖ یەكەمین سورەتی قورئان بەم شێوەیە دەست پێدەكات:-

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ"-" الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ "-"الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ "-"مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ "-"إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ "-"اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ "-"صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ "-"الفاتحة ١ -٧:"

("بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان بەناوی ئەو خوایەی كانگای ڕەحمەت و سۆزو بەزەییە""سوپاس و ستایش هەر شایستەی خوایەو بۆ خوایە، كەخاوەن و پەروەردگاری هەموو جیهانیان و هەموو بوونەوەرە" -"بەخشندەی میهرەبان، كانگای ڕەحمەت و میهرەبانیە"-"ڕەحمەتی لەدنیادا هەموو شتێكی گرتۆتەوە، بەڵام لەقیامەتدا تەنها بۆ ئیماندارانە" -"خاوەن و

ســـــەرداری ڕۆژی پاداشـــــت و ســـــزایە"-"پادشـــــای ڕۆژی قیامەتەکەدادیەروەری ڕەهاو بێ سنووری تێدا بەرپا دەکات" خوایە، تەنها هەر تۆ دەپەرستین و هەر لەتۆش داوای پارمەتی و پشتیوانی دەکەین"- "لەکاروباری دین و دنیاماندا، بەکەسی تر لەیەدەکانت ناکرێت"-"خوایەبەردەوام ڕێنموویيمان بفەرموو بۆ ئەم ڕێبازی ڕاست و دروستی ئیسلامە"-"کەبەرنامەو ڕێبازی ئەوانەیەلەنازو نیعمەتی خۆت بەهرەوەرت کردوون، نەمانخەیتەسەر ڕێبازی ئەوانەی خەشم و قینیان لێگیراوە"بەهۆی ئەوەوەدەیزانن و لایانداوە"، هەروەها نەمانخاتەسەر ڕێبازی ئەوانەش، کەسەرگەردان و گومڕان بەهۆی لاساری و یاخی بوون و نەزانینیانەوە "

❖ دووهەمین سوڕەتی قورئان بەم شێوەیە دەست پێدەکات :-

"الم "-" ذَٰلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ ۛ فِيهِ ۛ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ "-" الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ "-" وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ وَبِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ "-" أُولَٰئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِنْ رَبِّهِمْ ۖ

وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ "-" إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَأَنْذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنْذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ"-" خَتَمَ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَعَلَىٰ سَمْعِهِمْ وَعَلَىٰ أَبْصَارِهِمْ غِشَاوَةٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ "البقرة "١-٧"

("چەند پیتێك لەسەرەتای هەندێ لەسوورەتەکانی قورئاندا هاتوون ژمارەیان "١٤" پیتە، نیوەی کۆی پیتەکانی زمانی عەرەبین، بۆ سەلماندنی "اعجاز" و مەزنی و گرنگی قورئان کەلەتوانای هیچ کەسدا نیەبەو پیتانەکتێبێکی ئاوا بێ وێنەدابنێت، بەرادەیەك هەتا ئەگەر هەموو گرۆی ئادەمیزاد و پەری کۆببنەوەبۆ ئەو مەبەستەبێگومان ناتوانن، هەروەها چەندەها نهێنی تریشی تێدایە، زاناکان لەهەندێکی دواون، هەندێکیشیان وتوویانە: هەر خوا خۆی زانایەبەنهێنی ئەو پیتانە "-" ئەو قورئانەکتێبێکەهیچ گومانێکی تێدا نیە، "کەلەلایەن خوای پەروەردگارەوەرەوانەکراوەبەجبرەئیلدا بۆ پێغەمبەر "صلی اللەعلیەوسلم" کەمایەی ڕێنمووی و سەرچاوەی هیدایەتەبۆ خواناسان و پارێزکاران "کەئەوانەن فەرزەکان جێبەجێ دەکەن و لەحەرام خۆیان دەپارێزن، لەڕووی بیروباوەڕو کردارو گوفتەرەوە"-" ئەوانەی باوەڕ بەنەبینراوەکان دەهێنن "وەك خوا و فریشتەو

ئــەوانــەی خــوا باســی كــردوون و ئێمــەنایـانبینین"، هــەروەهـا نوێژەكانیان بەچاكی ئەنجام دەدەن و لەو ڕزق و ڕۆزییە"حەلاڵەی" پێمـان بـەخـشیوون، دەبـەخـشن"-" لـەهـەمـان كاتـدا ئـەوانـەبـاوەڕ دەهێـنن بـەو "پـەیامـەی" كـەبۆ تـۆ "ئـەی محمـد" صـلی اللـە علیەوسلم" دابەزێنراوەو بەو پەیامانەش كەبۆ پێغەمبەرانی پێش تۆ دابەزێنراوە" سەلامی خوایان لێ بێت" دڵنیاش دەبن كەڕۆژی دوایی پێش دێت و قیامەت هەر بەرپا دەبێت"-"ئەوانە لە سەر شا ڕێگـەی هیدایـەتی پەروەردگاریـانن و هـەر ئـەوانیش سـەرفراز و سەركەوتوو ئەمانەبنەما سەرەكیەكانی ئیمان و ئیسلامن "- "بـەڕاستی ئـەوانـەی كـەبێ بـاوەڕ بوون ئاگاداریـان بكـەیت یان ئاگاداریان نـەكـەیت یەكسانەبۆیان، باوەڕ و ئیمان ناهێنن..."- "چونكـەخـوا مۆری ناوەبەسـەر دڵ و گوێیانـدا و پەردەی بـەسـەر چاویانـدا هێنـاوە، "نـەبیـردەكـەنـەوە، نـەئامـادەن حـەق ببیـستن و ڕاستییەكان نابینن"، هەر بۆیەسزایەكی سەخت چاوەڕێیانە

ئـەمانـەش دەسـتەیـەكـن لـەبێ بـاوەڕان كـەهـەر خـوا خـۆی دەیانناسێت")

هیچ پەڕاوێكی تری ئاسمانی ئەم شێوازەی بەكارنەهێناوە ،یاخود بەم شـــێوازە نەنوســـــراوە كەزۆر *"ڕوونە"*. تەنـــــانەت پەڕاوە ئاسمانیەكانی تـر كە لەلایەن خـوای مەزنەوە دابەزیـوون ئێستا بونیان نیە وەك بنەڕەتی خۆیان "واتە بەوشێوازەی كەدابەزیون".

قورئـــــان ســـــەجەم وتەكـــــانی خـــــوای تۆمـــــاركردوە كەلەلایەن"*جوبرائیل*"ەوە هێنراوە بۆ پێغەمبەر" *صلى الله عليه وسلم*" پێغەمـــبەریش لەبەریكـــــردومو ،پاشـــــان ڕوونیكـــــردۆتەوە بۆهەوەڵەكانی ، ئەوانیش نویسویانەتەوە لەسەردەمی پێغەمبەر" *صلى الله عليه وسلم* "

لەوساتەوە تائێستا هـیچ سـوڕەت و ئایەتێـك نەگـۆڕاوە كەواتە "قورئان بەهەموو زانیاریەكانیەوە كتێبێكی بێهاوتاو موعجیزەیە كە "١٤"ســەدە لەمەوبەر دابەزێنــراوە. قورئــان دوانیگـــای خـوایە ،كەهەمــوو بابەتێـك لەخـۆی دەگرێـت و مامەڵەیـان لەگەڵـدا دەكـــات وەك :"پەرســـتن ، زانـــایی ، یاســـا، بیروبـــاوەڕ "بەڵام بەشـێوەیەكی سـەرەكی بـریتیە لە "پەیوانـدی نێـوان خـواو دروستكراوەكانی".

لەهەمانکاتدا ، دادوەری کۆمەڵگا ، دادوەری سیستەمی ئابوری و بەڕێوەبەرایەتی مرۆڤ دابین دەکات. قورئان ڕێنوێنی سەرجەم مرۆڤەکان دەکات "مامەڵە لەگەڵ مێشك و ناخ دەکات"

قورئان بۆسەرجەم مرۆڤەیەتی نێردراوە ،بانگەشەی قورئان تەنها بۆبەشێکی دیاریکراونیە لەخەڵك " ناوچە ، هۆز، ڕەنگێک یاخود زمانێک "بەم شێوەیە قورئان بانگهێشتی سەرجەم نەوەکانی "ئادەم" دەکات بۆ قوبوڵکردنی ئیسلام .ئەوانەی کەئیمانیان هێناوە پێیان دەوترێت "ئیمانداران".

مەبەست لەقورئان ڕێنمایی کردنە نەك گێڕانەوەی چیرۆك یان مێژوو، قورئان هانی خوێنەرانی دەدات بۆ بیرکردنەوە و تێڕامان کە "ئاکاری ڕێنمای ، هەستی ئیمان ، ڕەوشت ، ئامۆژگاری ،هەواڵی دڵخۆش ،وتەی هاندەری تێدایە "بۆئەوانەی کە شوێن ڕاستیدەکەون .

چەندین بەڵگە و مەسەلە خراونەتەڕوو بۆپێشگیری کردنی پەیامەکەی و فێرکردن. هەروەها ئاگاداری ئەوانەش دەکاتەوە کە پشتیان لەڕاستی کردووە.

## ٤-ناكرێت پێغەمبەر " صلى الله عليه وسلم " شێت و درۆزن بێت لەیەك كاتدا .

گروپێكی گەورە لەخەڵك لەدوای تاوتوێكردنی چەندان توێژینەوە وتیان "تاكە شتێك كەئێمە لێی دڵنیاین ئەومیە كە ئەو پیاوە "محمد"كەپێی وابوو پێغەمبەرە ،شێت بووە". پێیان وابوو كە پێغەمبەر " صلى الله عليه وسلم " فێڵی لێكراوە .

لەكۆتایدا هەمان گروپ وتیان لەبەرئەم"بەڵگەیە" –"تاكە شتێك كە ئێمە لێی دڵنیایین ئەوەئە كە "محمد"درۆزن بووە "خوانەكا" لەسەرەتادا دەستیان پێكردوو و رایانگەیان كە پێغەمبەر " صلى الله عليه وسلم " شێت و ناتەواوە ، پاشان وتیان كە پێغەمبەر " صلى الله عليه وسلم " درۆزنە .

هەرگیز هەستیان بەوە نەكردوە كە كەسێك ناتوانێت شێت و درۆزن بێت لەیەككاتدا. ئەتوانرێت یەكێكیان بێت یان شێت یان درۆزن ، بەڵام هەرگیز هەردوكیان نا .

ئەگەر کەسێك شێت بێت ،ئەوا ئەوکەسە کەسێکی بێهۆشە ، لەڕاستیدا پێی وایە کە پێغەمبەرە ، زیاتر لەمەش ،پێویستی بەدرۆکردن نیە سەرجەم کارو وتەکانی بەڕێکەوت بوون .

ئەگەر کەسێك درۆزن بێت ، ئەوا بەزۆری ئەوکەسە کەسێکی هۆشدارە وە بەئەنقەست درۆ دەکات بەمەبەستی بەدەست هێنانی سود و قازانج. تەنانەت ئەگەر کەسێکی شێت شتێکی هەڵەش بڵێ ئەوا ناتوانرێت بە درۆکەر بانگی بکرێت چونکە ئەو بۆخۆی لەڕاستی و واقیع ئاگادارنیە . بەم شێوەیە کەسێك ناتوانێت "شێت و درۆزن" بێت لەیەك کاتدا.

٣-ناکرێت پێغەمبەر" *صلی الله علیه وسلم* " فێڵکەر و سەختەکار بێت لەیەك کاتدا.

بەهەمان شێوە گروپێکی تری خەڵك دەڵێن کە پێغەمبەر" *صلی الله علیه وسلم* " فێڵی کردوە ، هەرکاتێك کەسێك پرسیاری لێکردبێت ،پێی وابووە کە فریشتەیەك وتەکانی خستۆتە ناوگوێیەوە .

هەمان گروپ بەڵگەیەکی تەواویان کۆکردەوەو ڕوونیانکردەوە کە ئەو کەسێکی ساختەکار بووە.

ئەوکەسانە سەرکەوتوو نەبوون بۆئەوەی هەست بەوەبکەن کەمرۆڤ ناتوانیت هەردوکیان بێت، دە بێت یەکێکیان بێت" *فێلکەریاخود "ساختەکار"* یاخود هیچیان .کەسێك کەفێڵی کردووە و پێی وایە کە پێغەمبەرە وە پرسیاری لێبکرێت ،بەدوای وەڵامدا ناگەڕیت یاخود لەکەس ناپرسێت.

لەلایەکی تر ،ساختەکار بەدوای باشترین وەڵامی گونجاودا دەگەڕێت بۆئەوەی ئاشکرا نەبیت کە پێغەمبەرێکی ساختەیە .بەڵام هەستی پێناکەن کە ڕەخنەگرتن لەئیسلام و پێغەمبەر تەنها خۆمندوکردنە .

ئەگەر پرسیاریان لێبکەی کە بنەڕەت و سەرچاوەی قورئان چیە ؟ئەوان وەڵامت دەدەنەوە و دەڵێن ئەوە تەنها لەخەیاڵ و مێشکی پێغەمبەردا بووە .ئەگەر زیاتر پرسیاریان لێبکەی کە چۆن پیاوێك جۆرەها زانیاری دەست دەکەوێت کە لەو سەردەمەدا کەس نەیزانیووە .

ئەوان دەڵێن کەسانی بیانی ئەو زانیاریەیان پێداوە ، وە درۆی کردوە کە پێغەمبەر بێت ، ئەگەر زیاتریش پرسیار بکەی کە چۆن درۆزنێك ئەتوانێت خاوەنی ئەو هەموو باوەڕ بەخۆبونە بێت کەئاماژە بەشتێکی نەزانراو دەکات. پاشان دەڵێن شێت بووە ، بەم شێوەیە بەناوبازنەیاکدا دەخولێنەوە .

لەوەڵامی سەرجەم بەڵگەو ڕەخنەکاندا خوای گەورە وەڵامی ڕەخنەگران دەداتەوە ، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت ؛

❖ "أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا ۗ مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ "-"الأعراف ١٨٤:

("باشە، ئەوە ئەو خەڵکە" بیریان نەکردۆتەوەلەگوفتارو ڕەفتاری محمد "صلی الله علیه وسلم "کەئەو هاوەڵەیان هیچ نیشانەیەکی شێتی پێوەنیە، بەڵکو ئەو "بەڕێزە"هیچ شتێك نیەجگەبێدارکەرەوەیەکی ئاشکرا نەبێت").

❖ "مَا أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ "-"القلم :٢"

("ئەی پێغەمبەر" صلی اللەعلیەوسلم" تۆ بەهۆی نازو نیعمەتی پەروەردگارتەوەدووریت لەشێتی یەوەوەکو نەفامن دەڵێن").

❖ "وَمَا صَاحِبُكُمْ بِمَجْنُونٍ "-"التكویر:٢٢"

("دڵنیابن کەهاورێکەتان محمد "صلی اللەعلیەوسلم" شێت نیەو لەکەماڵی"ژیریدایە").

٤- پێغەمبەر" *صلی الله علیه وسلم*" بەدەست ئارەزووی زۆر حەز لەدرۆ بوون دەناڵێنێت.

گروپێکی تر لەخەڵك هاتن وتیان پێغەمبەر" *صلی الله علیه وسلم*"-" بەدەست ئارەزووی زۆر حەز لەدرۆ بوون ناڵاندویەتی" ئەمە ناتەواوی دەروونیە ئەگەر کەسێك درۆ بکات و پاشان باوەڕ بەدرۆکانی بکات.

قورئان لەبارەی ڕاستی و حەقیقەت دەدوێت ئەوشتانەی کەتۆ ئەتوانی بۆیان بچی و سەیریان کەی و بیان بینی ئەواڕاستن ، واتە ئەوشتانەن کەئەتوانی ڕاستیان بکەیتەوە .

کەسی جەزلەدرۆکەر ناتوانێت ئەمە بکات ، ڕاستی و حەقیقەت کێشەیەکن بۆئەو

لەبەرئەوە دەروونناسەکان مامەڵە لەگەڵ ئەوکەسانە دەکەن کە هەڵگری ئەم نەخۆشیەن بەبەکارهێنانی *"ڕاستیاکان"*. ئەگەر کەسێك لەدەروندا نەخۆش بێت و بڵێت "من پاشای ئینگلتەرام"، دەروونناس بەئەو ناڵێت تۆشێتیت ،بەڵکو مامەڵەی لەگەڵ دەکات بە ڕاستیەکان بەم شێوەیە :" تۆ دەڵێیت من پاشای ئینگلتەرام" بۆیە پێمان بڵێ شاژنەکەت لەکوێیە؟ ،لێرەدا"درۆکەر" هەوڵدەدات پاساو بهێنێتەوە دەڵێت" شاژن چوەتە ماڵی دایکی" ئەی سەرۆك وەزیرانت لەکوێیە؟ مردووە؟ ئەی پاسەوانەکانت لەکوێن؟ "درۆکەر" لەبەرئەوەی ناتوانێت ڕوبەڕوی ڕاستیەکان ببێتەوە لەکۆتاییدا دەڵێت؛" پێم وایە کەمن پاشانیم"

بەهەمان شێوە :قورئان هانی خوێنەرانی دەدات بۆئەوەی ڕوبەڕوی ڕاستی ببنەوە ،بەم شێوەیەش ڕاستیان دەکاتەوە لەهەڵە .

بەم شێوەیە قورئان پاڵتپێوەدەنێت بۆئەوەی ڕاستی ببینی و هەڵەکان ڕاستبکەیتەوە .

## ٥-زانیاری نەزانراو لەقورئاندا .

قورئـــــان ڕێگەیەکـــــی بێهـــــاوتەیە کە خوێنەرەکـــــانی ئاگادارەدەکاتەوە ،"ئایە پێشتر ئەمەت دەزانی"هیچ پەڕاوێکی تری ئاسمانی ئەم شیوازە بێهاوتایەی نیە.

نوسراو پەڕاویی کۆن هەن کە زانیاری زۆریان تێدایە ، بەلاّم پێت دەڵێن کەزانیـاریەکە لەکـوێ هـاتوە .لەلایەکـی تـر قورئـان دەفەرموێت ؛

"تِلْكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهَا إِلَيْكَ-مَا كُنتَ تَعْلَمُهَا أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِنْ قَبْلِ هَٰذَا-فَاصْبِرْ-إِنَّ الْعَاقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ "-"هود :٤٩"

("ئەی محمد "صلی اللهعلیەوسلم" ئەو باسانەی بۆمان کردیت لەهەواڵەنادیارەکانەکەبۆت دەنێرین، نەتۆ دەتزانی و نەهۆز و نەتەوەکەشت پێش ئەم باسەی ئێمە، جا خۆگرو بەئارام بە، چونکەبەڕاستی پاشەڕۆژ بۆ خواناس و پارێزکارانە").

"نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ بِمَا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ هَٰذَا الْقُرْآنَ وَإِنْ كُنتَ مِنْ قَبْلِهِ لَمِنَ الْغَافِلِينَ"-" یوسف :٣"

("ئێمــەچــاکترین و جــوانترین چیــرۆك و بــەســەرهاتــت بــۆ دەگێرینــەوە ئــەی محمــد" صــلی اللــەعلیــەوســلم" بــەهــۆی ئــەم قورئانەی کەنیگامان کرد بۆ لای تۆ، لەکاتێکدا بێگومان تۆ لەپێش ئەم قورئانەدا لەم بەسەرهاتەی ئاگا بوویت").

ئەگەر پێغەمــبەر " *صلی الله علیه وسلم* " نەزان بوویێــت و ئەوانــی تــریش زانــا بــووبن ، ئەمە مەترســی هەبــوو کەبەم شێوە دلێــرانە قــسەیان بۆبکا،بەرەنگــار بــوونەوی نەیــاران کەنەزان بــوون لەویــارمیەوە ، لەگەڵ ئەوەشــدا، هــیچ کەس بەرەنگــاری ئەم ئایەتانەی نەکردووە .

## ٦- قورئان هەڵخەڵەتاندنە .

ئەوانەی کە ناتوانن بەرپەرچی قورئان بدەنەوە کە قورئان پەڕاوی ئاسمانیە و دابەزێنراوی خوایە، بەخۆ بەبیردۆزێکی گەشاوە هاتن وتیان"قورئان هەڵخەڵەتاندنە" ئەگەر قورئان"هەڵخەڵەتاندنە" ئەوا بنچینەکەی چیە ؟ فێڵی چیمان لێدەکات ؟ یاخود درۆکانی هەڵخەڵەتاندن لەکوێن؟ بەلام هیچیان هیچ هەڵخەڵەتاندنێکیان نەدۆزیوەتەوە ، لەبەرئەوەی هیچ هەڵخەڵەتاندنێکی تێدانیە .

١- ئێمە بڕیاری هەڵەدەدەین و خۆمان هەڵدەخەڵەتێنین بەمە .

هەندێ کەس بڕیار دەدات بەبێ بوونی هۆکار یاخود بیرکردنەوە بۆنموونە ، "من پێم وایە ئەو پیاوە دوژمنی منە" بەڵام من هیچ بەڵگە و هۆکارێکم نیە بۆسەلماندنی باوەڕەکەم ئەو ساتەی کەئەو دەبینم ، مامەڵەی لەگەڵ دەکەم وەك دوژمن ، پاشان بە خۆم دەڵێم. ئەها ڕاست بووم، سەیر کە ، وەك دوژمن مامەڵەم لەگەڵ دەکات ، ئەمە "جۆرێکە لە خۆهەڵخەڵەتاندن" لەسەرەتادا خاوەنی بیرو باوەڕێکی هەڵەبووم ، واشم لەخۆم کرد باوەڕ بەشتێکی هەڵە بکەم وە واشم لەخۆم کرد کەبیرو باوەڕە هەڵەکەم ڕاستە.

بەکورتی؛ ئێمە بڕیاری هەڵە دەدەین و خۆمان هەڵدەخەڵەتێنین بەهۆی تەرکیز کردن و بیرکردنەوە لێیان.

## ب- بەئەقل نیگا کۆتایی هاتووە ؛

بەپێی قورئان نیگا کۆتای هاتووە ، قورئان دەڵێت ئەمە نیگای خوایە ، هێندەی ئەو گفتۆگۆ راستەقینەیەی کە ئێوە لەنێوان خۆتاندا دەی کەن ،ئەگەر نیگا لە ئەقل ولۆژیك بەرزتربێت ، ئایە ئێمە چۆن بڕیار دەدەین کەکام لەو کتێبانەی کەبانگەشەی نیگایەتی دەکەن کامەیان ڕاستە و کامەیان هەڵەیە . ئیمام غەزالی دەفەرموێت : "باوەڕو عەقڵ هەردوکیان لەلایەن خواوەن و هیچ ناکۆکیەکیان لەنێواندانیە ".

## ٧-قورئان هانی گفتوگۆ دەدات .

زۆرێك لە موسوڵمانان باوەڕیان وایە کە قورئان هانی هیچ گفتوگۆیەك نادات ، بەم شێوەیە دورەپەرێز دەبێت لەهەموو گفتوگۆیەك ،سەبارەت بەقورئان و ئیسلام.

لەگەڵ ئەوەشدا قورئان هانی گفتوگۆو لێدوان دەدات؛-

"ادْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ ۖ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ "-"النحل :١٢٥"

("ئەی پێغەمبەر "صلی اللەعلیەوسلم"، ئەی ئیماندار بانگەواز بکەبۆ لای بەرنامەو ڕێبازی پەروەردگارت بەحیکمەت و دانایی "بۆ هەندێك" و ئامۆژگاری جوان و بەجێ، "بۆ هەندێکی تر"و گفتو گۆو موجادەلەبەجوانترین شێوە"لەگەڵ هەندێکی تردا بەتایبەتی خاوەن کتێبەکان"، چونکەبەڕاستی پەروەردگارت هەر خۆی زانایە، کەکێ گومڕایە، هەروەها هەر خۆیشی زانایەبەهیدایەت و وەرگران").

بۆئەو پرسیارە گوماناویانەی کە مرۆڤەکان دەتوانن بیری لێکەنەوە لەنیگادا بۆ بانگەشەو فێرکردن ، وەڵامی ئەم پرسیارانە لەقورئاندا دراوەتەوە ، وشەی عەرەبی *"قالوا"* کەبەواتای "ئەوان دەڵێن" "٣٣٢"و وشەی *"قل"* کەبەواتای "بڵێ" دێت بەهەمان شێوە "٣٣٢" لەقورئاندا هەتوە ·

## ٨- نەهێشتنی بژاردەکان

قورئان دەڵێت ئەم نیگایە لەلایەن بەدیهێنەری سەرجەم شتەکانە، ئەگەر بۆهەندێك هۆکار باوەڕت پێی نیە ، پاشان ئەوانە چین ؟ پێویستە ڕونکردنەوە بدەیت، ئەمە قەڵەم و مەرەکە ، ئەمانە لەکوێوە هاتون؟ قورئان دەڵێت ئەمە نیگایە. ئەگەر نا سەرچاوە بنەڕەتیەکەی لەکوێیە؟ لە کوێوە هاتووە؟ هەروەلامێك کەدرابێتەوە بۆئەم پرسیارە هەتا قورئان دابەزیوە بەریەرچی دراوەتەوە ، لەوانەیە هەندێك کەس بڵێت کە پێغەمبەر " *صلى الله عليه وسلم* "دانەری قورئانە."جابە مەبەستی بەدەست هێنانی مادده بوبێت ، شکۆ ، هێز، یەکخستنی عەرەبەکان یان بۆ چاکسازی ڕەوشتی "بوبێت .سەرجەم ئەمانە مەبەستی خۆیان نەپێکا.

لەوانەیە هەندێك بڵێن کە پێغەمبەر" *صلى الله عليه وسلم* " قورئانی لەسەرچاوەکانی تر وەرگرتووە .لەکاتێکدا لەوانەیە هەندێکی تر بڵێن ئەو کەسێکی درۆزن و شێتە ،سەرجەم ئەم

بیرۆكـــانە بەبـــێ ڕونكـــردنەوەی لـــۆژیكی. قورئـــان وەڵامـــی ئەوەدەداتەوە كە نیگا لەلایەن خواوەیە .

"تَنْزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ "-"الجاثية :٢" ❖

"ئەم قورئانەلەلایەن خوای باڵادەست و داناوە، هاتووەتەخوارەوە")

.( ❖ قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادَةً قُلِ اللَّهُ شَهِيدٌ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا الْقُرْآنُ لِأُنْذِرَكُمْ بِهِ وَمَنْ بَلَغَ أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ اللَّهِ آلِهَةً أُخْرَىٰ قُلْ لَا أَشْهَدُ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ وَإِنَّنِي بَرِيءٌ مِمَّا تُشْرِكُونَ "-"الأنعام :١٩"

("ئەی پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" بەوانەبڵێ كەشایەتیان دەوێـت لـەسـەر پێغـەمبـەرایـەتـی تـۆ) ج شـتێك گـەورەتـرو ڕاسـتترەلـەشـایەتیـدا؟! هـەر خـۆت بڵـێ: اللـەڕاسـترین شـایەتـە، كەشـایەتـی نێـوان مـن و ئێـوەیە، مـن ئـەم قورئانـەشـم بـەوەحـی و نیگا بۆ هاتووەتا ئێوەو هەموو ئەوانەی پێیان گەیشتووەئاگادارو بێدار بكەم، "لەگەڵ ئەم هەموو ڕوون كردنەوانەدا" ئایا ئێوەئیتر شایەتی دەدەن كەبەڕاستی لەگەڵ خوادا چەند خوایەكی تر هەبێت؟! بڵێ: "من بەش بەحاڵی خۆم" شایەتی ناحەق و نارەوای وا نادەم و بڵـێ: بـەڕاسـتی ئـەو خوایـەزاتێكـی تـاك و تـەنهایـەو مـن

بەڕاستی بەریم لەهەموو ئەو شتانەی كەئێوەدەیانكەنەهاوەڵ و هاوتای ئەو زاتە")

"وَأَنْ أَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَاتَّقُوهُ ۚ وَهُوَ الَّذِي إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ "-"الأنعام :٧٢" ❖

("هەروەها "فەرمانمان پێدراوە" نوێژو دروشمەكانی بەچاكی ئەنجام بدەن و لەخەشم و قینی خوا خۆتان بپارێزن، ئەو پەروەردگارەئەوەیەكەهەر بۆ لای ئەو كۆ دەكرێینەوە").

"إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ "-"يوسف :٢"

("بەڕاستی ئێمەئەم ئایەتانەمان دابەزاندووەلەشێوەی قورئانێكی پاراودا بەزمانی عەرەبی بۆ ئەوەی ئێوەلێی تێبگەن و ژیریتان بخەنەكار").

"وَكَذَٰلِكَ أَنْزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ الْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا "-"طه :١١٣"

("ئا بەو شێوەیەئێمەقورئانێكی عەرەبی و پاراو و ڕەوانمان دابەزاندووەو جۆرەها هەڕەشەشمان تیادا باس كردووە، بۆ ئەوەی

لەخوا بترسن و یاخود ببێتەهۆی ئەوەی کەیاداومریان تێدا بەدی بهێنێت").

"وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى الْقُرْآنَ مِنْ لَدُنْ حَكِيمٍ عَلِيمٍ "-"النمل :٦"

("ئەی محمد "صلی-اللەعلیەوسلم" بەڕاستی تۆ لەلایەن زاتێکی داناو زاناوەقورئان فێر دەکرێیت و پێت دەردرێت").

"تَنْزِيلُ الْكِتَابِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ "-" أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ ۚ بَلْ هُوَ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكَ لِتُنْذِرَ قَوْمًا مَا أَتَاهُمْ مِنْ نَذِيرٍ مِنْ قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ "-"السجدة : ٢-٣"

"دابەزاندنی ئەم قورئانەلەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوەهیچ گومانی تێدانیە:

ئایا خوانەناسان دەڵێن: "محمد صلی اللەعلیەوسلم" ئەم قورئانەی هەڵبەستووە؟ نەخێر وانی یە، بەڵکو قورئان حەق و ڕاستەو لەلایەن پرومردگارتەوەنێردراوە، بۆ ئەوەی قەوم و هۆزێك بێدار بکەیتەوەکەپێش تۆ بێدارخەرەوەیەکیان بۆ نەهاتووە، تاڕێگەی هیدایەت و ئیمان بگرنەبەر").

"وَالْقُرْآنِ الْحَكِيمِ"-" إِنَّكَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ "-"یس :٢-٣"(

("سوێند بەو قورئانەی کەهەموو فەرمانێکی لەشوێنی خۆیایەتی

بەڕاستی تۆ ئەی محمد (صلی اللەعلیەوسلم) لەفرستادەو پێغەمبەرانیت")

"تَنْزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ "-"الزمر:١"

"هاتنەخوارەوەی ئەم قورئانەلەلایەن خوای باڵادەست و داناوەیە").(

"تَنْزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ "-"غافر:٢"

("هاتنەخوارەوەی ئەم قورئانەلەلایەن خوای باڵادەست و شارەزا و زاناوەیە").

"تَنْزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ "-"الجاثية :٢"

"ئەم قورئانەلەلایەن خوای باڵادەست و داناوە، هاتووەتەخوارەوە").(

"الرَّحْمَنُ "-" عَلَّمَ الْقُرْآنَ "_"الرحمن :٢"

"خوای میهرەبان، کانگای سۆزو ڕەحمەت "-"(

قورئـانی فێـری ئـادەمیـزاد کـردووە" فێربـوون و زانینـی قورئـان و تێگـەیـشتن لـەفـەرمـوودەی خـوای میهـرەبـان پیرۆزتـرین نـازو نیعمەتەکەئیماندار لێی بەهرەومر ببێت لەم تەمەنەکورتەی ژیانی دنیادا

"إِنَّهُ لَقُرْآنٌ كَرِيمٌ "-" فِي كِتَابٍ مَكْنُونٍ "-" لَا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ "-" تَنْزِيلٌ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ "الواقعة :٨٠"

("بـەڕاسـتی ئـەوەی کـەمحمـد "صـلی اللـه علیـەوسـلم" دەیخوێنێتـەوەقورئانێکـەزۆر پیـرۆزو بـەڕێـزە"-" لـەکتێبێکـی شاراوەدا کـە"لـوح المحفـوظ "، پارێزراوە، "هـەروەهـا نـسخەکانی سەر زەویشی پارێزراوەو پارێزراو دەبێت هەتا دنیا دنیایە"-" تەنها پاکان نەبێت کەس دەستی لێ نادات "-" ئەم قورئانەلەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوەنێردراوەتەخوارەوە")

"إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ تَنْزِيلًا "-"الانسان :٢٣"

("دڵنیاش بەئەی" محمد صلی اللەعلیەوسلم" هەر ئێمەقورئانمان بۆ تۆ دابەزاندووەبەش بەش تا خەڵکی پێ بێدار بکەیتەوە"

# بەشی حەوتەم

## ١- تاقیکردنەوەی پێچەوانە سەلمێنراو :-

کۆمەڵگای زانستی پشت بەم بیروبۆچونە دەبەستێت ،زۆرێك لەخەڵك پەیدادەبن لەگەڵ بیردۆزێکی نوێ، کۆمەڵگەی زانستیش بێزار نابێت بە گوێگرتن لێیان، زاناکان هۆکارێکیان هەیە بۆکردنی ئەمە وە دەڵێن"ئەگەر تیۆرێکت هەیە ،بێزارم مەکە بەهۆی تیۆرەکەت،مەگەر لەگەڵ بیردۆزەکەت دێت کە دەی سەلمێنن کە خۆت و بیردۆزەکەت دورن لەهەڵە" ئەمە پێی ئەوترێت"تاقیکردنەوە پێچەوانە سەلمێنراو".

ئەمەش وایکرد کەسەرنجی بیردۆزەکەی *"ئەلبێرت ئینستن"* بدەن، بەخۆ بەبریدۆزێك هات و وتی من پێم وایە جیهان بەم شێوەیە کاردەکات، وەئەم سێ ڕێگایانە دەی سەلمێنن کەمن هەڵەم . زاناکان کاریان لەسەر ببیردۆزەکەی کرد بەمە بەستی تاقیکردنەوە.

ماوەی شەش ساڵی بەسەردا تێپەری لەئەنجامدا سەلمێنرا کەئەو کەسێکی گەورەیە بەڵام ئەوە سەلمێنرا کەئە و شیاوی ئەوەیە سەرنجی بدرێت تەنها لەبەر"تاقی کردنەوەی پێچەوانە سەلمێنراو".

قورئان پێشنیار بۆ خوێنەرانی دەکات، بۆ چەندین " تاقی کردنەوەی پێچەوانە سەلمێنراو"مەبەست لەهەندێکیان رابردوو بووە و هەندێکی تریشیان بۆهەموو کاتەکانی تر .قورئان دەڵێت ؛ ئەگەر هەرشتێك لەسەر ئەو بینچینەیە نەبوو کە بانگەشەی بۆدەکات ،پاشان هەمووتان پێویستە شتێك بکەن بۆسەلماندنی کە قورئان هەڵەیە .

ئەم "تاقیکردنەوە" بێ هاوتایە لە هیچ ئاینێکی تردا بوونی نەبووە ، ئەگەر گفتوگۆت لەگەڵ هەر کەسێکی تردا کرد، پرسیاری لێبکە ،ئایە هیچ شتێك لەئاینەکەتدا هەیە رێگەت بدات بەرگری لێبکەی ، ئە گەر توانیم ئەمە یان ئەوە بکەم ئەوا ئەی سەلمێنم کەئاینەکەت هەڵەیە.

گومانم هەیە هەردینێکی تر خاوەنی ئەم جۆرە تاقیکردنەوەیە بێت بۆ پێشنیارکردن.

مرۆڤ نابێت تەنها ئیمانەکەی خۆی نیشان بدات ،بەڵکو ئەبێت ، هەلیش بداتە کاسانی تر بۆئەوەی بیسەلمێنین کە باوەڕەکەی هەڵەیە. قورئـان چەنـدین هەل دەدات بـۆئەوەی بـسەلمێنرێت کە هەڵەیە ،هەنـدێك لەم تـاقیکردنەوانە پێـشنیارکراون لەقورئانـدا بۆنمونە :-

## ١-چیرۆکی ئەبولەهەب.

پێغەمـبەر " *صلی الله علیه وسلم* " مـامێکی هەبـوو نـاوی "ئەبولەهەب"بوو کەبەواتای" *باوکی بڵیسە*" دێت، ئەم مامەی پێغەمبەر یەکێـك بـوو لە بەهێزتـرین دوژمنەکـانی پێغەمـبەر و ئیسلام. هەمیـشە دوای پێغەمـبەر دەکەوت هەرکاتێـك بینیبـای کە پێغەمبەر" *صلی الله علیه وسلم* "قسە بۆڕێبوارێك دەکات چاوەڕێی دەکـرد هەتـا تەواو دەبـوو و لێکجیـادەبوونەوە، پاشـان پرسـیاری لەڕێبوارەکە دەکرد "*محمد*" چی بەتۆ وت؟ ئایە وتی ڕەش ؟ ئەمە

سپیە، ئایە وتی بەیانیە ؟ ئەوە شەوە ،لەسەر ئەوە ڕاهاتبوو کەهەر شتێك بڵێت دژی وتەکانی پێغەمبەر بێت.

خواله قورئاندا دەفەرموێت :

"تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ - مَا أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ - سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ- وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ - فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِنْ مَسَدٍ"

دەستەکانی بشکێت ئەبو لەهەبو ڕسوا بێت، ئاشکرایەکەهەر ڕاسوایش دەبێت و ("لەناو دەچێت- ماڵ و دارای و ئەو شتانەی کەبەدەستی هێناوە، فریای نەکەوت - لەئایندەدا دەخرێتەناو ئاگرێکی بڵێسەدارەوەهەمیشەگوریسێکی چنراو لەپوشی خورما لەگەردنیایەتی (لەقیامەتیش دا زنجیری ئاسن دەکرێتەگەردنی")

ئەم سوڕەتە ئەوە ڕوندەکاتەوە کە ئەبولەهەب و خێزانەکەی دەمرن و لەناودەچن ، وە هەرگیز نابن بەموسوڵمان و دەچنەناو ئاگری دۆزەخەوە .

ئەم سورەتە "١٠"ساڵ پێش مردنی ئەبولەهەب دابەزیووە ، هەروەها بەبێ ئیمانی لەجەنگی بەدردا مردووە ، لەماوەی ئەم دەساڵەدا چەندان کەس و هاوڕێی ئەبولەهەب هاتنە ناوئیسلامەوە، ئەبولەهەب زۆر زیرەك بوو وەیەکێك بوو لە دوژمنە سەرسەختەکانی ئیسلام، هەردەم بەپەرۆش بوو بۆئەوەی بیسەلمێنێت کە قورئان هەڵەیە و هی مرۆڤە.

سەرجەم ئەوکارانەی کە ئەبولەهەب کردنی بۆبەدرۆخستنەوەی ئیسلام و ئەم سورەتە تەنها ئەوەبوو کە جارێك لەجاران لەماوەی ئەم دەساڵەدا بڵێت *"من موسوڵمانم"* خۆئەگەر بەدرۆش وتبای هەر بەناو ئەوا ئەو کاتە دەسەلمێنرا کەقورئان هەڵەیە .بەڵام نەك هەربەڕاستی بەڵکو بەهەڵەش وەك موسوڵمان ڕەفتاری نەکردووە. پێغەمبەر " *صلی الله علیه وسلم* "بە ئەبولەهەبی دەگوت تۆڕقت لەمنە . ئەتەوێت کۆتایم پێ بهێنی، وەرە ئەم وشانە بڵێ "من موسوڵمانم" وەرە دەریان ببڕە ، ئەبولەهەب "١٠"لەبەردەستدا بوو بۆبیرکردنەوە لەم باسە.بەڵام هەرگیز ئەم قسانەی دەرنەبڕی.هیچ کەسێکی ناژیر ئەمە ناخاتە ناو قورئانەوە، قورئان دەبەزێنراوی خوایە و نوسراوی دەستی پێغەمبەر نیە.

ب- جولەكەكان بەدوای مردندا ناگەڕێن.

قُلْ إِنْ كَانَتْ لَكُمُ الدَّارُ الْآخِرَةُ عِنْدَ اللَّهِ خَالِصَةً مِنْ دُونِ النَّاسِ فَتَمَنَّوُا الْمَوْتَ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ "-" وَلَنْ يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ "-"البقرة٩٤-٩٥

("ئەی محمد "صلى الله عليەوسلم" پێیان بڵێ: ئەگەر ڕاست دەكەن و باوەڕتان وایەكەماڵی ئەو دنیا "بەهەشت" لای خوا تایبەتمەندەبەئێوەنەك خەڵكی تر، دەئاواتی مردن بخوازن ئەگەر ڕاست دەكەن "تا زوو بچنەناو بەهەشت!!"-"

بەڵام ئەوانەهەرگیز بەهۆی ڕەفتاری نادروست و دەست پێشخەری ناپەسەندیانەوەئاواتی مەرگ ناخوازن، خوایش چاك ئاگادارەلەحاڵی ستەمكاران").

كاتێك جولەكەكان هاتنە لای موسوڵمانان بۆئەوەی بەرەنگاریان بكەن و وتیان"دواین ماڵی خوا" واتە "بەهەشت" واتە بەهەشت تەنها بۆجەلەكەكانە نەك بۆكەسانی تر. قورئان تكا لەجولەكەكان دەكات بۆئەوەی داوای مردن بكەن ، ئەگەر ئەوان دڵسۆز و ڕاستگۆن .قورئان بەردەوامەو دەفەرموێت "ئەوان هەرگیز داوای مردن ناكەن" لەبەر ئەوتاوانەی كەكردویانە .

تاکە شتێك کەجولەکەکا دەیان توانی لەسەردەمی پێغەمبەردا بیکەن بەمەبەستی بەدرۆخستەنەوەی قورئان ئەوەبوو کەداوای **"مردن"** بکەن تەنانەت ئەگەر یەکێك لەجولەکەکان وتبای "مـــن داوای مـــردن دەکەم" تەنهـــا هەربە دەم نەك بەدڵ ئەوا ئەوکـاتە دەسـەلمێنرا کەقورئـان هەڵەیە.زۆرئاسـان بـوو کە بسەلمێنرێت کە قورئان هەڵەیە .

خواش لەقورئاندا دەفەرموێت:-

"وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ النَّاسِ عَلَىٰ حَيَاةٍ وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا ۚ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِ مِنَ الْعَذَابِ أَنْ يُعَمَّرَ ۗ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ "- "البقرة :٩٦"

("سوێند بێت ئەو جوولەکانەدەبینیت کەلەهەموو خەڵك بەپەرۆشترن لەسەر دنیاو ژیانی دنیا بەهەر جۆرێك بێت، هەتا بگرەلەهاوەڵپەرست و موشریکەکانیش، هەریەك لەوانەئاوات دەخوازێت کە: هەزار ساڵ تەمەنی ببێت، هەر چەندەوەنەبێت تەمەنی درێژیان لەسزا ڕزگاریان بکات، خوایش زۆر بینایەبەو کردەوانەی کەئەنجامی دەدەن").

ج- مەسیحیەکان نزیکترن لەموسوڵمان زیاتر لە جولەکەکان.

لەقورئاندا چەندین"تاقیکردنەوەی پێچەوانە سەلمێنراو"هەنە.کەبۆ ئەمرۆ و سەرجەمکاتەکان گونجاون ، قورئان دەفەرموێت :-

"لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً لِلَّذِينَ آمَنُوا الْيَهُودَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُوا ۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُمْ مَوَدَّةً لِلَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ قَالُوا إِنَّا نَصَارَىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ "-"المائدة :٨٢"

("سوێند بەخوا دەبینیت و دەستت دەکەوێت سەر سەخترینی خەڵك لەدوژمنایەتیدا بەرامبەر بەوانەی کەباوەڕیان هێناوە، جولەکەن و ئەوانەی کەهاوەڵیان بۆ خوا داناومو سوێند بێت دەبینیت و دەستت دەکەوێت نزیکترینیان لەسۆز و خۆشەویستی بۆ ئەوانەی کەباوەڕیان هێناومئەوانەن کەدەیانوت: بەڕاستی ئێمەنەصرانین، ئەوش لەبەر ئەوەیەبەڕاستی هەندێك لەوان قەشەی دیندارن و هەندێکیشیان گۆشەگیرو کەسانی خواپەرستن و بێگومان ئەوان خۆ بەگەورەدانانێن").

قورئـــان دەفەرموێــت لەنێــوان دووگروپــی خەڵکــدا"مەســیحی وجــولەکە"کانــدا بەگــشتی مەســیحیەکان مــامەڵە لەگەڵ موسوڵمانان دەکەن باشتر لە جولەکەکان ،چەندەها جولەکە هەنە کە باوەڕیــان بە ئیسلام هێنــاوە ،لە کاتێکــدا هەنــدێکی تریــان باشــن لەگەڵ موســوڵمانان ،بەڵام بەشــێوەیەکی گشتی وەکـــو" کـــۆمەڵگەی جـــولەکە" لەڕوی مـــامەڵەکردنەوە مەسیحیەکان باشترن لە جولە کەکان.

ئەمــڕۆ جولەکەکــان هەلێکــی باشــیان هەیە کە بڵــێن قورئــان هەڵەیە ، ئەگەر ئەوان بۆمــاوەی دوو ســاڵ خۆیــان یەکــبخەن و مــامەڵە یەکــی بــاش لەگەڵ موســوڵمانەکان بــکەن باشــتر لە مەســیحەکان. پاشــان بڵــێن "ئەهــا ئــێمە زیاترلە مەســیحیەکان میهرەبانترین لەگەڵ ئێوە" یاخود کێ لەجیهاندا باشتر مامەڵە لەگەڵ موســوڵمانەکان دەکــات ؟ ئــێمە یــان مەســیحیەکان؟ جولەکەکــان هێــشتا ئەمەیــان نەوتــوە ، بەڵام هێــشتا ئەتــوانن بیــسەلمێنن کە قورئــان هەڵەیە ئەگەر مامەڵەکانیــان بگــۆڕن ، بەڵام هەرگیز نایگۆڕن.

## ٢ - ئایەتێك لەوشێوەیە بهێنن.

ئیماندار و بێئیمان هاوڕان کە باشترین ئەدەبی عەرەبی لەسەر زەوی بوونی هەبێت بریتیە لە قورئانی پیرۆز .کە زمانەکەی سەرنجڕاکێش ، دەوڵەمەند و ڕەوانبێژە.

کاتێك بت پەرستەکان بانگەشەی ئەوەیان کرد کە **"محمد"** ساختەی کردووە و قورئانی داهێناوە ڕاستەوخۆ قورئان بەرەنگاریان بویەوەو پێشنیاری کردن بە "تاقی کردنەوەی پێچەوانە سەلمێنراو"

"قُلْ لَئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنْسُ وَالْجِنُّ عَلَىٰ أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هَٰذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا "-"الإسراء :٨٨"

("ئەی محمد صلى اللهعليهوسلم پێیان بڵێ: سوێند بەخوا ئەگەر هەموو ئادەمیزادو پەریەکان کۆ ببنەوەو "هەوڵی بەردەوام بدەن تا" قورئانێکی وەکو ئەمەدانێن و بیهێننە"مەیدان" ناتوانن کاری وابکەن و ناتوانن لەوێنەی بهێنن، ئەگەر چی هەموو لایەکیان ببنەپشتگیرو یارمەتیدەری یەکتر").

أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا بِعَشْرِ سُوَرٍ مِثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ "-"هود :١٣"

("بەڵکو "لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا"ئەوانەدەڵێن کەمحمد قورئانی هەڵبەستووە، پێیان بڵێ: جا ئێوەش دەسوورەتی هەڵباستراو وێنەی ئەم قورئانەبهێنن، هەر کەسیش لەخوا گەورەبەدەر، دەتوانن، بانگ بکەن "بۆ هاوکاریتان پەنای بۆ بەرن" ئەگەر ڕاست دەکەن").

أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِثْلِهِ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ "-"يونس :٣٨"

("بەڵکو "لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا" ئەوانە دەڵێن کەمحمد "صلی اللەعلیەوسلم" قورئانی هەڵبەستووە، بڵێ: دەئێوەش سوورەتێك وەك سوورەتەکانی داڕێژن و بیهێنن، داوا بکەن لەهەر کەسێکی تر کەدەتوانن جگە لەخوا "کەیارمەتیتان بدات" درێغی مەکەن ئەگەر ڕاستگۆن").

٣- بنەماكان بۆ هێنانی ئایەتێك.

ئەوبنەمایانەی كە پشتیان پێدەبەسترێت بۆهێنانی ئایەتێك وەكو قورئان ئەمانەن:-

❖ قورئان خاوەنی ئاستێكی بەرزە .

❖ زمانی قورئان زمانێكی"خاوێن ، واتادار،ڕوون ،بێئەندازەو ناوازەیە.

❖ قورئان لەبەردەم ڕاستی ڕاناكات و ڕەوانبێژ ،سەرواو شێوەی خۆی هەیە ،پێچەوانەی ئەدەب وشیعری مرۆیی.

❖ زۆرجار قورئان زانیاریەك دوبارەدەكاتەوە بەڵام بەشێوەیەكی جیاوەز.

❖ قورئان بەكەمترین وشە واتایەكی مەزن دەبەخشێت.

بت پەرستەكان نەیان توانی كارێكی ئەوتۆ بكەن و بیسلمێنن كە پێغمبەر " *صلى الله عليه وسلم* "قورئانی بەدیهێناوە .لەكۆتایدا . قورئان تاقیكردنەوەی پێچەوانە سەلمێنراوی "خستە كار.

وَإِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ "-"البقرة :٢٣"

("جا ئەگەر ئێوەلەدوو دڵیدان و گومانتان لەم "قورئانەپیرۆزە" هەیەكەدامانبەزاندووەبۆ بەندەی خۆمان محمد "صلى اللهعلیەوسلم" ئەگەر بۆتان دەكرێت ئێوەش هەوڵ بدەن سوورەتێكی وەك ئەو بهێنن، هاوپەیمان و هاوكارەكانیشتان جگەلەخوا "بۆ ئەو مەبەستە" بانگ بكەن ئەگەر ئێوەڕاست دەكەن").

"فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا وَلَنْ تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ "-"البقرة :٢٤"

("خۆ ئەگەر نەتانتوانی و هەرگیز نایشتوانن "كەواتەباوەڕبهێنن و" خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی: سووتەمەنیەكەی خەڵكی و بەردە، كەبۆ بێ باوەڕ و خوانەناسان ئامادەكراوە").

سورەتێکی قورئان کەتەنها سێ خەتە و کەمترین وشەی لەخۆی گرتووە ، نەیان توانی شتێکی ئەوتۆ بهێنن و بەردوە وامبن لەم بەرەنگاریە، باشترین شاعیرەکانی ئەوسەردەمە باشترین هەوڵیاندا بەڵام بەخراپی کەوتن لەم کارە، هەندێك لەوشتانەی کەدایان هێناوە پارێزراون لە شوێنەمێژوییەکان بۆئەوەی نیشان بدرێن کەچەندە *"گاڵتەجارن"* ئەمانە سەروایان نەبوو وەکو قورئان ، ناومرۆکەکەیان بێ مانابوو وە هیچ زیرەکی و شادومانیان تێدابەدی نەدەکرا.

ئەمە هەتا ئێستا بەرەنگاربونەوەیەکی سەرتاسەریە ، بۆماوەی "١٤٠٠" نەکراوە و ناشکرێت قورئان دەفەرموێت:-

"أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ ۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا

"-"النساء :٨٢"

("ئەوەبۆ ئەوانەسەرنجی قورئان نادەن و لێکی نادەنەوەو لێی وردنابنەوە؟ خۆ ئەگەر لەلایەن کەسێکی ترەوەبوایەجگەلەخوا بێگومان جیاوازی و دژایەتیەکی زۆریان تێدا دەدۆزیەوە").

قورئـان هـیچ دژێتـی و نـاكۆكی تیـدانیه .ئەگەر هەركەسێك ئەیەوێت بیسەلمێنێت كە قورئـان وتەی خـوانیه ، ئەوا بـا تەنهـا ئایەتێـك لەقورئانـدا بهێنێـت كە نـاكۆكی و دژیەتـی تێـدابێت. زۆرێـك لە بێبـاوەڕان هەوڵیـان دا بـۆنەوەی شـتێكی لەم جـۆرە لەقورئانـدا بـدۆزنەوە بەلام سەرجەم هەوڵەكانیـان بـێ نـاوەڕۆك و هەڵەتێگەیشتن بوون .

"الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ ۚ الرَّحْمَٰنُ فَاسْأَلْ بِهِ خَبِيرًا "-"الفرقان :٥٩"

("ئەو زاتەی كەئاسمانەكـان و زەوی و هـەرچـی وا لـەنێوانیانـدایـه لـەمـاوەی شـەش ڕۆژدا دروسـتـی كـردووە، لـەوەودوا لـەسـەر عـەرش وتەختی فەرمانڕەوایی وەستاوەخوا پەروەردگارێكی میهرەبانە، جا بـۆ تێگـەیـشتن لـەوردەكـاری و گرنگـی بـەدیهێنـراوەكـانی لـەجیهـانی ئـەستێرەكـان و كۆمـەڵـەی خـۆر و ئـادەمیـزاد و گیانلـەبـەران و ڕووەك و ...هتـد) لـەكـەسێكی ئاگـاو زانـا بپرسه")!!

بەهەمـــان شـــێوە، ئەگەر بتەوێـــت پرســـیاری زانـــستی بکەیـــت کەلەقورئانـدا باسـکراوە ئەوا پێویستە پرسیار لە "زانـا"بکەیـت. لەلایەکـی تـر ، ئەگەر پرسـیارم لێبکەی سەبارەت بە چۆنیەتی خوێنـدنەوەی قورئـان یـاخود هەڵەی ڕێزمـانی لەوانەیە مـن نەتوانم وەڵامت دەمەوە ،چونکە من تەنها تەلەبەیەکم لە فێربونی زمانی عەرەبیدا.لەبەرئەوە تائێستا نەسەلمێنراوە کە قورئان وتەی خوانیە ، قورئانیش دەفەرموێت "لەکەسێکی زانا بپرسە"

بۆیە پێویستە پرسیارلە "قارء" بکەی کەشارەزایە لە خوێندنەوەی قورئان و ڕێزمانی عەرەبی ،ئەگەرپرسیاری زانستی بکەی لەوانەیە مـن باشـتر وەڵامـت بـدەمەوە چـونکە مـن تیایـدا پـسپۆڕم ، لەبەرئەوەی زیـاتر لە "٥" سـاڵ خوێنـدومە بەمەبەسـتی بەدەست هێنانی "*بەکالۆریۆس لە پزیشک-نەشتەرگەری زگورتە*"*MBBS* پلەی "

# بەشی هەشتەم

## أ- چەمکی بونی خوا لەقورئاندا.

ا- هەموو ناموسوڵمانێك پێویستە ڕازی بێت کەوقورئان وتەی خوایە.

هەموو کەسێکی ژیر کەبڕوای بەهەبوونی خواهەیە بەرگری لەوەناکات کە قورئان وتەی خوانیە،لەدوای نیشناندان و خستەنەڕوی چەندین بەڵگە.

بەڵام بۆ بێباوەڕێك کەبڕوای بەهەبونی خوانیە،ئەگەر پرسیاری لێبکەی "ئایە قورئان وتەی خوایە" ئەمە پرسیارێکی بێ بنەمایە،چونکە ئەو باوەڕی بەهەبونی خوانیە، چۆن باوەڕ بەوە بکات کە قورئان وتەی خوایە وە هیچ شتیکی لەبیرو هۆشدا دروست ناکات.

ب- پیرۆزە ؛

یەکەمین شتێك کەدەمەوێت بیکەم لەگەڵ بێباوەڕێك ئەوەیە کە بڵێم *"پیرۆزە"* زۆربەی ئەوانەی کەبارەڕیان بە چەمکی هەبوونی خواهەیە ، بیروباوەڕێکی "کوێر"یان هەیە.

لەوانەیە کەسێك مەسیحی بێت چونکە باوکی مەسیحیە.
زۆربەی خەڵکی تر وەکو"هیندۆس"ن لەبەر باوك و باپیریان،
وەزۆربەی موسوڵمانانیش موسوڵمانن لەبەرئەوەی باب و باپیریان
ئیماندارن .
بەشێکی زۆری خەڵکی لەجیهاندا کوێرانە شوێنی ئاینی باب
وباپیریان کەوتون ، لەوانەیەکەسێك بنچینەکەی بگەڕێتەوە بۆ
خێزانێکی ئاینی بەڵام لەهەمانکاتدا بەرگری لە بونی
خوابکات ،چونکە ڕازی نیە بەوەی کەلە ئاینەکەی یاخود
لەدایك و باوکی فێربووە.
لەوانەیە موسوڵمانان پرسیارم لێبکەن "زاکیر"بۆچی پیرۆزیایی
لەبێ باوەڕ دەکەی ،هۆکارەکەش ئەوەیە کە ، ئەو باوەڕی
بەیەکەم بەشی قورئان هەیە ***"لاالە"*** هیچ خوایەك نیە ، نیوەی
کارەکەی تەواوکردووە ، تەنها بەشێکی ماوە کەبریتیە لە ***"الا
اللە"*** جگە لە خوا.بۆیە پێویستە چەمکی هەڵەی بونی خوا
ڕەشبکەنەوە و چەمکی بونی خوای ڕاستە قینە وەرگرن.
ج- چەمکی بونی خوا لە مەنتیقدا"لۆژیك"

یەکەمین پرسیارم بۆ بێباوەڕ ئەومیە کە ***"پێناسەی خوا چیە"*** بۆکەسێك کە دەڵێت خوانیە پێویستە واتای خوا بزانێت، وادابنێ من کتێبێکم لەناو دەستم هەڵگرتومو دەڵێم ئەمە ***" قەڵەمە"*** کەسی بەرامبەر نەبێت بزانێت کە پێناسەی قەڵەم چیەوە ڕاستم بکاتەومو پێم بڵێت ئەمە قەڵەم نیە و کتێبە.

تەنانەت ئەگەر نەشزانێت کە چیم لەناودەستم هەڵگرتوە و دەڵێت ئەمە قەڵەم نیە ، پێویستە بزانێت کە قەڵەم چیە ، بەهەمان شێوە، بۆکەسێك کەدەڵێت خوانیە ، بەلایەنی کەم پێویستە بزانێت کە چەمکی بونی خوا چیە.

ئەگەر ناموسوڵمانێك باوەڕی وابێت کە ئیسلام لەگەڵ زانست ناگونجێت ،لەم هەستە سنوردارەدا ناموسوڵمان ڕاستە بۆڕاست کردنەوەی بیرۆکەکەی سەبارەت بەئیسلام ،کێشەکەش ئەومیە کە وێنەیەکی هەڵەی سەبارەت بەئیسلام لەمێشکی دا سەبارەت بەئیسلام هەیە.

تەنانەت منیش وێنەیەکی ئاوا هەڵە سەبارەت بەئیسلام ڕەت دەکەمە وە ،بەڵام لەهەمانکاتدا وەك موسوڵمانێك ئەوە ئەرکی منە کە بۆنیشاندانی وێنەی ڕستەقینەی ئیسلام بەرامبەر

ناموسوڵمانان، ئێمە پێویستە هەڵەتێگەیشتن و خراپتێگەیشتن لابەرین و ڕوونی بەکەینەوە کە ئیسلام ئاینێکی بەسۆزو میهرەبانە. کە مافی یەکسانی دەدات بەئافرەت وەلەگەڵ لۆژیکدا ناکۆکی نیە .

د- چەمکی بونی خوای گەورە بەپێی سورەتی *"اخلاص"*

"قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ "-" اللَّهُ الصَّمَدُ "-" لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ "-" وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ"الاخلاص"

("ئەی محمد "صلی اللەعلیەوسلم" ئەی ئیماندار بڵێ: ئەو خوای کەناوی " الله" خوایەکی تاك و تەنهایە"بێ هاوەڵ و هاوتایە"-" خوا زاتێکی پایەدار و دەسەڵاتدارە، نیازی بەکەس نییەو هەموویان ئاتاجی ئەون، هەر ئەو دەتوانێ بەڵاو و ناخۆشی لابەرێت و پێویستی و داخوازیەکانمان جێ بەجێ"-" هیچ کەسی لێ نەبووەو خۆشی لەکەس نەبووە "-" هەرگیز هاوتاو هاوشێوەو دەسەڵاتدارێکی تر نییەکەلەبەرامبەریەوەبوەستێت و هاوشانی بێت").

ئەم چوار خەتە پێناسەی خوا دەردەخەن ، ئەگەر هەركەسێك ئەم چوارخەتە لەخۆیدا جێبەجێدەكات ، ئەوا ئێمەی موسوڵمان لاریمان نیە لەبونی بە خوا .

ئەم سورەتە بریتیە لە "فورقان" بنەمای جیاكردنەوەی حەق لە باطل

## ٢- بنچینەی خواناسی "Theology"

لە قورئانی پیرۆزدا سورەتی اخلاص بریتیە لە" چەمكی بونی خوا"، ئەم زاراوەیە لە دوو بەواتای خوێندن دێت "logy" لەزمانی گریكیدا بەواتای خوادێت وە "theo" برگە پێك دێت

بەمەش بەواتای "خوێندنی خوادێت" وە سورەتی اخلاص "بنچینەی فێربونی خوایە" ئەگەر تۆبتەوێت گەوهەرێك بكڕی یان بفرۆشی سەرەتا پێویستە نرخەكەی دابنێیت ، وەك هەڵسەنگاندنی گەوهەرەكە لەلایەن زێڕنگەرەكەوە ،وە بەراوردكردنی لەگەڵ بنچینەكەی،لەدوای پاككردنەوەی

گەهەرەکە ڕەنـــگەکەی بەراورد دەکـــات لەگەڵ نمـــونەی زێڕەکانی تر.

جایـان "٢٤" حەیـار دمردەچـی یـان کـوالێتی نزمتـرە "٢٢" دمبێـت یـاخود "١٨" دمبێـت ،لەوانەشـە هەر زێـڕ نەبێـت چـونکە "هەمـوو شتێکی درموشاوە زێڕ نیە".

بەهەمـان شـێوە، سـورەتی اخـلاص بینچینـەی فێربـونی چەمکـی خـوایە، کەئەی سـەلمێنیت ئەو خـوایەی کەتـۆ ئەی پەرسـتی خوایەکی ڕستەقینەیە یـان نـا. ئەم سـورەتە وەسـفی خوای گەورە دەکات .

## ٣ -ئایە باگوان ڕاجنیش خوایە؟

هەنـدێك خەڵـك باوەڕیـان وایە کە *" باگوان ڕاجنیش یان ئۆشـۆ"* خـوای گەورمیە . "ئەمـانە وتەی مـن نـین مـن تەنهـا دمریـدەخەم" هەنـــدێك کەس دەڵـێن ئۆشـۆ خـوای گەورمیە. جارێکیـان لەکۆبونەوەیەکدا لەماوەی پرسـیارو وەڵامـدا، هیندیەکی بەڕێز هەبوو کە بە هەڵە لەقسەکەم تێگەیشت ، وتی هیندۆسەکان

ئۆشۆ وەك خوا نایپەرستن، من ئاگادارم کەئۆشۆ بە خوانازانن بەڵام ئۆشۆ شوێنکەوتوی هەنە.

بائێستا ئۆشۆ بخەینە ژێر تاقیکردنەوە.

ا- یەکەمین بنەما بریتیە " قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ " بڵێ خواتاکو تەنیایە، ئایە ئۆشۆ تاك و تەنیا بوو؟ هەروەك دەزانین چەندین کەس بانگەشەی خوایەتیان کردووە لەناو مرۆڤەکاندا. چەندان کەس دۆزراونەتەوە لەوڵاتەکەماندا "هیندیستان" بەدڵنیاییەوە ئۆشۆ تاك و تەنیا نەبووە ، هەرچەندە، هەندێك لەشوێنکەوتوانی هێشتا وانیشان دەدەن کە ئۆشۆ تاك و تەنیایە .

ب- بنەمای دووەم بریتیە لە " اللَّهُ الصَّمَدُ " خوا تەواو نەمرە. ئایە ئۆشۆ تەواو نەمریووە؟ لەژیان نامەکەیەوە ئێمە ئەوە فێردەبین کە ئۆشۆ ئازاری چەشتوە بە هۆی نەخۆشی شەکرە، هەناسەتەنگی و پشهێشەی درێژخایەن. ڕایگەیاندوە کە حوکمەتی ئەمەریکا ژەهرخواردی کردوە کاتێك لە ئەمەریکاله زینداندا بووە. سەیرکە، خوا ژەهر خۆرکراوە،

هەموانیش ئەوە ئەزانن کە ئۆشۆ مردووە و شێردراوەتەوە کەواتە نە کەسێکی تەواو بووە نەکەسێکی نەمر.

ج- سێهەمین بنەما " لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ "کەسی لێنەبووە و لەکەسیش نەبووە . لەکاتێکدا ئۆشۆ "جەبەلپۆر "لە هندستان لەدایك بووە ومنداڵی هەبووە . وەك سەرجەم مرۆڤەکان دایك و باوکی هەبووە . دواتر هەڵیان بژاردووە و بوون بەشوێنکەوتەی ، ئۆشۆ کەسێکی زۆر زیرەك بووە ، لە ساڵی ١٩٨١ رۆیشتووەتە ئەمریکا، لە ئۆریگۆن شارۆچکەیە کی بەناوی *"راجنش پیورام"* دامەزراندووە و حوکمەتی ئەمریکاش وەستاندویەتی و لەساڵی ١٩٨٥ گەڕاندویەتە وە هندیستان و دەستی بە *"راجنش نیوسانیاس کۆمیون"* کردووە ،پاشان ناوەکەی بووە بە *"ئۆشۆکۆمیون"* لە *"پیون"* ئەگەر سەردانی ئەم شوێنە بکەیت دەبنیت کە لە "ئۆشۆ کۆمیون " لە سەر بەردی کێلەکەی نوسراوە " ئۆشۆ هەرگیز لەدایک نەبوەو هەرگیز نەمردووە" تەنیا سەردانی هەسارەی زەوی کردوە لە ١١ کانونی یەکەمی ١٩٣١ تا کانونی دووەمی ١٩٩٠ بەڵام لەبیریان کردووە کەئەمە لەسەر کێلەکەی بنوسن . کە ئۆشۆ

بۆ ٢١ دەوڵەت ڤیزەی لێداوە ، سەیرکە ، خوای گەورە سەردانی زەوی دەکات و پێویستی بە ڤیزا دەبێت .

د- چوارەمین بنەما " وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ " واتە هیچ کەس وەکو ئە و نیە ، ئێستا بۆت دەرکە وت کە ئەم کاندیدە "ئۆشۆ" خوانیە. ئێمە ئەوە دەزانین کە ئۆشۆ مرۆڤ بووە و خوا هەزاران جار بەهێزتر لە "ئەرنۆلد" کەیەکێك بووە لە بە هێزترین پیاوەکانی جیهان .ئەگەر هەرکەسێك بەراورد بکەی بە خوا جاچ "کینگ کۆنگ" بێت یان "ئۆشۆ" ئەوا نابێت بە خوا چونکە خوا وێنەی نیە.

# بەشی نۆهەم

## سیفەتەکانی خوا:

"قُلِ ادْعُوا اللَّهَ أَوِ ادْعُوا الرَّحْمَٰنَ ۖ أَيًّا مَا تَدْعُوا فَلَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ ۚ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا "-"الإسراء :١١٠"

("پێیان بڵێ: ئێوەلەنزاو دوعاتاندا هاوار لە"الله" بکەن، یان بەسیفەتی پیرۆزی "الرحمن "هانای بۆ بەرن، بەهەر ناوو سیفەتێکی جوان و بەرز هاوارى لێبکەن و نزا بکەن دروستە، چونکەئەو خاوەنی هەموو سیفات و ناوەپیرۆزو جوانەکانە، بەهەر سیفەتێك کەلەگەڵ داخوازیەکانتاندا گونجا، داوای لێ بکەن، لەکاتی داواکردنی ڕزق و ڕۆزیدا بە"یا ڕزاق، یا وهاب" لەکاتی داوای سەرکەوتندا بە"یا قوی یا متین یا عزیز یا ....هتد، ئەی ئیماندار" لەکاتی خوێندنی قورئان لەنوێژەکاندا دەنگ بەرز مەکەو زۆریش نزمی مەکە، لەو نێوانەدا حاڵەتێکی لەبارو مامناوەندی ئەنجام بدە").

نەتوانیت هاواربکەیتە خوا بەهەرناوێت کەدەتەوێت بەڵام ئەبێت ناوێکی جوانبێت و ناشیرین نەبێت یاخود هیچ وێنایەك لەمێشکدا دروست نەکات. قورئان زیاتر لە "٩٩" ناوی خوای

تێدایە،هەندێك لەوانە " الرحمن" الرحيم، الحكيم..."سەدەهەمین ناویش بریتیە لە **"الله"** .

"وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ فَادْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ "-"الأعراف :١٨٠"

("هەر بۆ خوایەهەمــوو نــاوەجــوان و پیـرۆزەکــان، جــا "ئــەی ئیمانـداران" بـەو ناوانـەدۆعـا و نـزا بکـەن و هانـاو هـاوار بـۆ ئـەو زاتـەبـەرن، واز بهێنن لـەوانـەی کـەلـەناوەپیـرۆزەکانی خوادا لادان دەکـەن و "سـیفـەت و نـاوەکـانی خـوا بـەکـاردەهێـنن بـۆ غـەیـری خـوا"، لـەئاینـدەدا پاداشـتی ئـەو کـارو کـردەوانـەیـان وەردەگـرن کەئەنجامیان دەدا").

"اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ "-"طه :٨"

اللـەزاتێکـەکـەجـگـەلـەو خوایـەکـی تـر نیـە، هـەرچـی نـاوەپیـرۆزو سیفاتەجوانەکان هەیەهەر شایستەی ئەوە")

"هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلَامُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ ۚ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ "-" هُوَ اللَّهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ الْمُصَوِّرُ ۖ لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ ۚ يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ "-"الحشر :٢٣-٢٤"

("خوا ئەو زاتەیەکەجگەلەو خوایەکی تر نیەپاشای هەموو بوونەوەرە، پاك و بێگەردو پوختە، ئاشتی خواز و ئاشتی پەروەرە، ئاسایش بەخش و پەناگای ئیماندارانە، دەسەڵاتدارەو چاودێری دروستکراوەکانیەتی، بالادەستە، خاوەنی خێری بێسنوورە، گەورەیەو خۆی بەگەورەدەزانێت، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەیەلەوەی تینەگەیشتوان شەریك و هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەن"- هەر ئەو خوایەبەدیهێنەرو دروستکراوە، "لەنەبوون هەرچی بۆی بەدی دەهێنێت"، نەخشەو وێنەکێشەرە، ناوەپیرۆزو جوانەکان، هەمووی شایستەی ئەون، هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدا هەیەستایشی ئەو دەکەن، بەڕاستی ئەو زاتەخوایەکی بالادەست و دانایە").

بە رامبەر وشەی *الله*یە"God" یاخود"God" بەکارهێنانی وشی *الله* یان وشەی

"خوا" .*God*".موسوڵمانان هاواردەکەنە خوا بەناوی"*الله*" خۆی، لەجیاتی وشەی ئینگلیزی"

چونکە وشەی عەرەبی *الله* پاکترو بێهاوتاترە، بەپێچەوانەوە وشەی ئینگلیزیەکە بەچەند شێوەیەك بەکاردێت، بۆنمونە:-

واتە "خواكـان".لەكاتێكـدا الله تـاك "God-s"ی بۆزیـاد بـكەی دەبێتە كۆ "S"ا- ئەگەر

وتەنیایە و كۆی نیە.

واتە "خوای مێ"هیچ شتێك بونیە "God-dess"ی بۆزیاد بكەی دەبێتە"dess"ب-ئەگەر

بەناوی خوای"مێ یان نێر"اللهڕەگەزی نیە.

واتە "بـاوكی خـوا ئەو بـاوكی "God-father"ی بۆزیـاد بـكەی دەبێتە"father"ج- ئەگەر

خوای منە "لە ئسلامدا هیچ شتێك بەناوی" باوكی خوا"نییە.

واتە "دایكــی خــوا" بەهەمــان"God-mother"ی بۆخیــاد كەی دەبیتە"mother"د- ئەگەر

هیچ شتێك لەئسلامدا بەناوی" دایكی خوا" بونی نییە.

واتە" "Fake god"بۆنمونە "Tin-God" لەپێشی زیادبكەی دەبێتە "tin"ه- ئەگەر

"خـوای فێڵبـاز". "الـلە" وشـەیەكی بــێ هـاوتەیە كە هـیچ پێـشگرو پاشـگرێك ناتوانرێـت لەگەڵـی بەكاربهێنرێـت. لەبەرئەوە ئیمانـداران پێیـان باشـترە بڵـێن"الـلە" لەكـاتی ئـامەژە كردن و ناوبردنی خوای گەورە.

# قورئان و زانستی هاوچەرخ

ئەو ڕێگایانەی کەبوونی خوادسەلمێنن لەوانەیە قەناعەت بە هەندێك لەکافرەکان بهێنن بەڵام هەموشیان نا . زۆرێك لە لەوانە داوای بەڵگەی زانستی دەکەن بۆبونی **"خوا"**،منیش هەمان بیروبۆچونم هەیە ئەمرۆ سەردەم سەردەمی زانست و تەکنەلۆژیایە. بازانیاری زانستی بخەینەگەڕ بۆ سەلماندنی بونی خواو لەهەمانکاتیشدا کە قورئان نیگای ئاسمانە.

ئەگەر ئامێرێك یاخود شتێك کە هێشتا کەس نەیبینیوە یان هیچی نەبیستوە لەبارەی ئەو ئامێرە نیشانی بێباوەڕێك یاخود هەرکەسێکی تری بدەی و پرسیاری لێبکەی ، یەکەمین کەس کێیە کە دەتوانێ شێوازی کارکردنی ئەم ئامێرە ڕوونکاتەوە؟ دوای کەمێك بیرکردنەوە ، دەڵێت،"دروستکەری " ئامێرەکە، هەندێکی تر دەڵێن "بەرهەم هێنەرەکە"یان هەندێکی تر دەڵێن "پیشە گەرەکە".

هەروەلامێك کەدەدیدەنەوە لە مێشکتا بیپارێزە ، بەدڵنیاییە وەڵەمەکە یەکێك لەمانە دەبێت، "دروستکەر،دەرهێنەر یاخود پیشەگەر"ە .

ئەوهۆکارە زانستیانەی کەلەقورئاند ئەمازەیان پێکراوە :-

## بیردۆزی ئەگەری.

لە بیرکاریدا، بیردۆزێك هەیە بەناوی *"بیردۆزی ئەگەری"* ئەگەر دوو بژاردەت هەبێت کە کامەیان ڕاستە یا کامەیان هەڵەیە، ئەگەر بەشە ڕاستەکە هەڵبژێریت ئەوا نیوە دڵنیایت یەکێك لەم دوو بژاردەیە ڕاستەواتە لەسەدا ٥٠٪ هەلی ئەوەت هەیە ڕاست بێت.

بەهەمان شێوە، ئەگەر دراوێکی ئاسن بهاوێژی لە٥٠٪ شانست هەیە ڕاست دەربچێت ١/٢ ئەگەر دراوە ئاسنەکە بۆجاری دووەم بهاوێژی، ئەوا تۆ هەر لە ٥٠٪ هەلت هەیە کە ڕاستە کە دەربچێت، *(نیوە×نیوە)(١/٢×١/٢)*، دەکاتە ١/٤ . خۆئەگەر دراوەکە بۆجاری سێیەم بهاوێژی بۆهەرسێجارەکە *(١/٢×١/٢×١/٢)*واتە *(٥٠٪، ٥٠٪،٥٠٪ )* ئەنجامەکەی دەکاتە ١/٨ ١٢.٥٪.

نمونەیەکی تر:-

بەردەزارێك شەش لای هەیە ، ئەگەر بیهاوێژی و ژمارەیەك لە ناختا جێگیر بکەی "١-٦" ئەو ئەنجامەی کە بیری لێدەکەیتەوە یەکێك لەمانە دەبێت" ١-٢-٣-٤-٥-٦" واتە ١/٦.

ئەگەر بۆجاری دووەم بیهاوێژی بەهەمان شێوە، کەواتە( 1/6 ×1/6) خۆئەگەر بۆجاری سێهەمیش بیهاوێژی دەکاتە 1/6 ×1/6 ×1/6 =1/216 کەکەمترە لە 1/2 لەسەدا.

بائیستا ئەم بیردۆزە لەقورئاندا تاقی بکەینەوە .

وادابنێ کەکەسێك سەرجەم ئەوزانیاریانەی زانیوە کەلەقورئاندا ئاماژەیان پێکراوە ، لەو سات و کاتەدا نەزانراو بوون.

لەوساتەی کەقورئان دابەزی خەڵك باوەڕی وابووە کە جیهان تەخت بووە، وە چەندەها بژاردەی تر هەن بۆشێوەی زەوی"سێ گۆشە، چوارگۆشە،پێنج گۆشە، شەش گۆشە ،حەوت گۆشە ،هەشت گۆشە .شێوەی گۆیی....هید" ،باوادابنێنی کە ٣٠ شێوە هەیە بۆزەوی .

قورئان بەڕاشکاوی دەڵێت شێوەی زەوی "گۆییە" کە واتە ١/٣٠ .

مانگ خاوەنی ڕوناکی خۆیەتی یان وەری دەگرێت ،قورئان بەڕاشکاوی دەڵێت "مانگ ڕوناکی وەردەگرێت" ئەمەش بژاردەیەك بوو لەنێوان دوو بژاردەدا. ١/٢

قورئــان ئامــاژە بەوە دەكــات، كە هەرشــتێكی زینــدوو لەئــاو دروستكراوە ، ئەگەر ئێمە ١٠،٠٠٠ بیروبۆچونی جیاوازمان هەبێت سەبارەت بەم باسە. كەهەمــوو شتێكی زینــدوو لە " دار ، بەرد ، مس، ئەلەمنیۆم ، فافۆن ،زێڕ ،زیوەئۆكسجین ، هایدرۆجین ،نەوت، ئاو ، چیمەنتۆ، كۆنكرێت..هید" قورئـان بەڕاشكاوی دەڵێت سەرجەم شتێكی زینــدوو لە ئــاو دروســت بــووە .

كەواتە "١" لەنێوان ١٠،٠٠٠ هەزار بیروبۆچوندا .

كەواتە بۆهەربیرۆكەیەك لەنێوان" *شێوەی زەوی . ڕوناكی مانگ .دروستبوونی مرۆڤ"*

$1/٣٠ \times 1/٢ \times 1/١٠٠٠ = 1/٦٠،٠٠٠ = ٠.٠٠١٧\%$

كەواتە زانست سەلماندی كە ئەوسێ بیرۆكانەی كە قورئـان باسی كردوون ئەم ڕۆ ڕاست دەرچوون ، وە قورئـان ئاماژە بەهەزاران شتی ئاوادەكات ، كەلەو سەردەمەدا نەانـراو بوون تەنها لەسێ ئەگەردا.

من ئەوە بۆخوێنەرانی ڕۆشنبیر بەجێ دەهێڵم بۆئەوەی کار لەسەدان هۆکاری نەزانراو بکەن کەبونیان هەیە یاخود دەتوانێرێت هەستاین پێبکرێت .

سەرەنجامی سەرجەم بژاردەکان ڕاست دەرچوو بێئەوەی دانەیەکیان هەڵەبێت ، ئەمە لەپشتەوەی توانای مرۆڤە کە سەرجەم بژاردەکان ڕاست دەرچن ، بەبێ بوونی هەڵەیەك ، ئەم سەلماندە خۆی لەخۆیدا بەسە بۆ کەسێکی ژیر کەبنیەڕاتی قورئان ئاسمانە .

## قورئان کتێبی هێماکانە (الایات)نەك کتێبی زانست.

بابیرت بخەمەوە قورئان کتێبێکی زانست نیە بەلام کتێبێکی هێماکانە ، قورئان زیاتر لە ٦٠٠٠ هەزار ئایەتی تێدایە،لەکاتێکدا زیاتر لە هەزاردانە قسە لەسەر زانست دەکات.

بۆئیمانداران قورئان فورقانە بنەمای جیاکردنەوەی ڕاستی لەناراستی ، بەلام بۆ ڕۆشنبیری ناموسوڵمان زانیاری زانستی گەورەترین تاقیکردنەوەیە کەباوەڕی پێیەتی . بەبەکارهێنانی گەورەترین پێوەر کەناموسوڵمان باوەڕی پێیەتی ، من دەی

سەلمێنم کەقوریان وتەی خوایە. لەکاتێکدا ١٤٠٠ لەمەوبەر دابەزیوە .

قورئان زانیاری زانستی تێدایە ،کەلەم دواییانەدا دۆزراونەتەوە، لەکۆتایی گفتوگۆکەدا ئێمە هەردوکمان دەگەیینە ئەنجامێك کە خوا لوتکە و پایەبەرزی زانستە.

## بەدیهێنەر دانەری قورئانە.

تاکە وەڵامێکی لۆژیکی بۆپرسیارەکە ئەوەیە ،کێ ئاماژەی بەسەرجەم ئەو هۆکارە زانستیانە کردووە، کە١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر دابەزیوون و لەمەدواییانەدا دۆزراونەتەوە ،وەڵامی ئەم پرسیارە هەمان ئەو وەڵامەیە کە پێشتر ڕونمانکردەوە ، کەکێ داتوانێ شێوازی کارکردنی ئامێرێکی تازە ڕونبکاتەوە، کەبریتی بوو لە : "دورستکەر ، بەرهەمهێنەر یاخود پیشەگەر"لەزمانی ئینگلیزیدا ناوێکی تر هەیە بۆ "دورستکەر ، بەرهەمهێنەر یاخود پیشەگەر"

"الله" "God" دروست کەری هەموو جیهان کەبرتیە لە

زانست سەرجەم تیۆرو بیرۆکەکان لادەبات و بوونی خواش دەسەلمێنێت.

*فرانسس باکۆن*، فەیلەسوفی بەناوبانگ ، بەراشکاوی وتویەتی " هەبوونی زانیاریەکی کەم لەسەر زانست بێباوەڕت دەکات، بەڵام خوێندنی زانست بەقوڵی موسوڵمانت دەکات"

"سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ "-"فصلت :٥٣"

("ئێمە لەئایندەدا بەڵگەو نیشانەی سەرسوڕهێنەریان نیشان دەدەین لەئاسۆکانی بوونەوەرداو لەخودی خۆیشیاندا "بێگومان ئاشکرایەکەلەسەردەمی زانستیدا چەندەنهێنیەکانی بوونەوەر ئاشکرا بووە.. زاناکان بەگشتی و زاناکانی ئەستێرەناسی سەرگەردانن لەوردەکاری و دامەزراوی و گەورەیی و فراوانی ئەم گەردوونە، هەروەها لەئاڵۆزی جەستەیی و عەقڵیی و دەروونی ئادەرروونی ئادەمیزاد". ئەمەش بۆ ئەوەی تا چك بۆیان ڕوون بێت و دڵنیابن کەئەو زاتەحەق و ڕاست و ڕەوایە، ئایا شایەتی پەروەردگارت بەس نیەکەبێگومان ئاگا و زانایەبەهەموو شتێك")؟!

# ناوەڕۆك